شیعر





سابیر گۆران

# هاڵاوی زامەکانم

هەولێر ٢٠٢٣

ناوی کتێب: هاڵاوی زامەکانم

نووسینی: سابیر ساڵح عەزیز (سابیر گۆران)

بابەت: هۆنراوە

دیزاینی ناوەڕۆک: سۆران تاودەر

دیزاینی بەرگ: حامد سەقزی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

قەبارە: ١٧*٢٤سم

جۆری کاغەز: باڵکی ٧٠ گرام

جۆری بەرگ: هارد کەڤەر

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٢٠٢٣/٤٧٨ – هەولێر – هەرێمی کوردستان

چاپخانەی شەهاب - هەولێر

# پێڕست

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

پێشکەشە بە:

- گیـــانی شـــاعیری چەوســـاوەکان، بـــرای شـــەهیدی جـــوانەمەرگم مامۆســـتا (جەمیـــل ڕەنجـــبەر) و شـــەهید (یاسین)ی برام.
- گیـانی بـرزاوی (ئاسـک)ی دایکـم و (حــاجی ســاڵح)ی باوکم.
- چینی ڕەنجدەر و زوڵم لێکراوی وڵاتەکەم بەگشتی.

# سـوپـاس و ڕێـز...

- بۆ (ئایشێ)ی هاوژینم کەپشتیوانم بووە، لەکاروانی سەختی ژیانم.
- بۆ هەموو ئەو کەس وکارو هاوڕێیانەی پشتگیریان کردم و بوونە هـۆی بەچاپ گەیاندنی کتێبی "هاڵاوی زامەکانم".
- سوپاسـی هەمـوو ئەو بـرادەرانە دەکەم کە بە تێبینییەکانیـان ئەم کتێبەیان دەوڵەمەند کرد بە تایبەت برایانی عەزیزم کازم کۆیی و فەرید عەبدوڵڵا.
- جێـی خـۆیەتی سوپاسـی یەکە یەکەی کارمەنـدانی چاپخـانەی شەهابیش بکەم کە زۆر دڵسۆزانە کاریان بۆ بە جوانیی ئەم کتێبە کـرد بەتـایبەتی هەردوو بـرای بەڕێـز سـۆران تـاوەدەری بەڕێـوەبەر و کـاک حامدی دیزاینەری بەرگ.

# بەرکوڵ

شیعر خوێنانی لە دڵا شیرین، لە ساڵی دوو هەزار و هەژدە، بە تەمابووم شیعرەکانم بە ناوی "مەرگی ناو چەماوە" بە چاپ بگەیەنم بەڵام بۆم نەڕەخسا، پێشەکییەکیشم بۆ دەستنووسە ئامادەکراوەکەی ئەوسام نووسیبوو بەناوی "دەسپێک" کەلەدوای ئەم بەرکوڵە دامناوەتەوە و دەستبەرداری نەبووم. هەرچەند من زۆر درەنگ کەوتووم لە بڵاو کردنەوەی کتێبی شیعری تایبەت بەخۆم، لەبەر زۆر هۆکار، وائەمجارە بڕیارم داوە زۆربەی شیعرەکانم لەم کتێبەدا بڵاوکەمەوەو تا دیدەتانی پێ ڕۆشن بێتەوە، گەلەک حەزم دەکرد شیعرەکانم بەخۆشاوی ژیان ناوببەم بەڵام بۆم نەکرا، چونکە لە گەڵ زۆربەی ناوەرۆکەکەی نەدەگونجا، بۆزانین؛ چەند شیعرێکیشی تێدا نییە، کە زۆر حەزم دەکرد لەگەڵ ئەم شیعرانەدا بن، چونکە بە ڕای چەند هاوڕێیەکی نزیکم ئێستاکە وەختێکی لەبار نییە، بۆیە با بمێنن بۆدەوروزەمانێکی تر، هەندێ لەو شیعرانەشم لەلاپەڕەی فەیسبوکی خۆم بڵاوکردۆتەوە، بەڵام ئەوەی لەسەر ئەم کتێبەیە جیاوازە و تەتەڵە کراوە، هیوادارم سەڵیقەتان هەبێ بۆ خوێندنەوەیان. بێگومان فۆرم وناوەرۆکی تێکستەکانیش بە پێی قۆناغەکانی ژیانم گۆڕانکاریان بەسەر داهاتووە، شیعرەکانیش هەمە چەشنەن؛ دڵداری، کۆمەڵایەتی، فیکری، مێژوویی، تەوس "تەنز"ی سیاسی هتد... . بەروارو پێرستیشیان بۆ داندراوە، تا بە ئاسانی بگەن بەهەر شیعرێکی بتانەوێ زووتر بیخوێننەوە، خوێنەران و لێکۆڵەرانیش بە پێی ساڵ و ڕۆژی نووسینیان، شیعرەکان هەڵبسەنگێنن. هەندێ لە هۆنراوەکانیشم وەک ئەوەی مێژووی ژیانی خۆم و کۆمەڵگاکەم بە شیعر یاداشت کردبێ ئەوهایە. بۆیە لەهەندێک شیعردا بۆباشترگەیاندنی ناوەرۆکەکەی ڕەنگبێ گرنگی کەمترم دابێ بە فۆڕمەکەی .هەروەهاهەندێ

زاراوەو وشـەش هەیە کەدووبـارە بـوویتەوە بەهـۆی هـاتنە پێشـەوەی ڕووداوی نوێ و هەڵوێست وەرگـرتن لەهەمبەریـان، بەتـایبەتیش لەم سـاڵانەی دواییـدا. بەهیچ جۆرێـک لایەنگـری هـیچ لایەنێکـی دیـاریکراوم نەکـردووە، هەرچەنـد لە هەندێ کاتدا سـۆزم بۆیـان هەبـووبێ، تەنهـا بەرگـریم لە گەلـی کـوردو چینـی زەحمەتکێش و ماف خوراو کردووە، ڕاسـتە هەنـدێ لە شـیعرەکانم وشـەکانیان ڕەقە، چونکە وێنەی واقعێکی تاڵم کێشـاوە کە بـوویتە تـاڵاو لە قـوڕگی خـۆم و گەلەکەم، بێگومـــان هەق و ڕاســـتیش هەردەم ڕەقە. دوا وتەم؛ شـــاعیر بـــوون بەرپرسیاریەتێکی گەورەیە، بەئومێدم لە خوێندنەوەی شیعرەکانم وەڕس نەبـن، خۆ ئەگەر لە گەنجییەوە عەشق ڕای نەکێشامایە سەر ڕێچکەی شیعر، ڕەنگبێ ئێستاکە من دوور بوومایە لە کۆڕی شیعر و شاعیران، فەرموون ئێـوەو هـاڵاوی زامەکانم کە ڕەنـگە هەر تـاکێکی کـۆمەڵگە خـۆی لە هەنـدێک شـیعروکۆپلەیاندا ببینێتەوە. هیوادارم ببێ بە خۆشاوێکی بە تام و چێژی لێ ببیـنن. هەربـژین و بمێنن بە خۆشی و ئاسوودەیی شیعر دۆستانی ئازیز...

هاڵاو: هەڵاو: هەڵمی بەتین و گەرم

**سابیر گۆران**

هەولێر ٢٠٢٣/٣/٣١

# دەستپێک

## سابیر گۆران

"بە هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر هەتا توانیم شیعرەکانم لە فەوتان ڕزگاربکەم".

نزیکەی نیو سـەدەیە، لە سـاڵی هەزارو نۆسـەدو شێسـت ونۆوە سـەروکارم لەگەڵ شیعردا هەیە. لەوکاتەوەی لەگەڵ شاعیری چەوساوەکان، شـەهید جەمیـل ڕەنجبەری برام، لە بنمیچی یەک ماڵ و لە یەک قوتابخـانە و لە یەک پـۆل دا گەورە بووین، وەک جمکەش لەمنداڵی دایم پێکەوەبووین. منیش خولیای شـیعر ببـووم، هەندێ دەمـان لەگەڵ شـیعردا دۆسـت و پێکبـووم، هەنـدێ دەمـانیش بێتـاقەت و دڕدۆنگبووم. چەنـدین دەفـتەری شیعریشـم فەوتـاوە . کەهەنـدێ لەو شـیعرانەی کەفەوتاون کاتی خۆی زۆرم خـۆش دەویسـتن . لەبەر ئەو بـارودۆخە نالەبـارانەی ژیـانم تێـدا گوزەرانـدووە "سیاسـی و ئـابوری و کـۆمەڵایەتی هتـد"نەمتوانیوە بەردەوام دەست لە ملانێی شیعر بکەم، بەهەر حاڵ لەوچل و نۆسـاڵەدا، ناوەنـاوە دوور دەکەوتمەوە لەگۆڕەپانی ئەدەبی و ناوەناوەش نزیک دەبوومەوە، بەڵام هەرگیز بەرۆح لێی دانەبڕاوم .لەسەرەتادا شیعری کرچ وکاڵی سیاسیم دەنوسی نەمدەوێرا بە هەموو کەسێکی نیشان بدەم، تاکەکەس کە نیشانم دەدا "جەوهەرکرمانج" بـوو بەوپێیەی ئەودەمی هاوڕێیەتییەکەمان پتەوبوو .دواتر تووشی هەودایەکـی بەتـێن و عەشـقێکی گـڕداری بەئاکـام نەگەیشـتووی گەنجـانە بـووم، وەک سـیامەند بۆخەجێ و وەک مەم بـۆ زینـێ دەسـووتام و پێـوەی دەتـلامەوە، ئەگەر چـاودێری دایکم نەبوایە ڕەنگبێ تووشی کارەسـات و گرێیەکـی دەروونـی ئەوتـۆ ببوومـایەوە کەدەرچوون لێی مەحـاڵبێ . جـا دەسـتم بەنووسـینی شـیعری ئەوینـداری کـردو شـیعر لەنـاخمەوە وەک کـانی هەڵـدەقوڵاو وەک چـرۆ چەکەرەی دەکـردو یەخەی پێدەگرتم، تاکە پەناگەم بوو کەخەمەکانمی پێ هەڵبڕێـژم و لەبیرخـۆمی بـبەمەوە. لەساڵی حەفتاو یەک تا دەهات بڕوام بەتوانای خۆم پتر دەبوو . تـا جـارێ چـووم بۆ ماڵی پەشێو لەسێتاقان، دەفتەری شـیعرەکانی خـۆم دایـێ، ئەویـش بـۆ ڕۆژی دواتـر لەسـەر دەفـتەرەکەم بەقەڵەمێکـی سـەوز، حەوت خـاڵی بـۆم نووسـیبوو، ئێستاش ئەو دەست خەتەی پەشێو لای من ماوە.

**که ئەوە دەقی نووسینەکەی پەشێوە:**

برا لەم سابیر

چاوەکانت ماچ دەکەم

تـۆ یەکێکـی لەوگەنـجە خـوێن گەرمـانەی، لە شـاری هەولێـر هەوڵ و تەقەلای ئەدەبـی یـان هەیە. نـامەوێ لەم سـەرنجەما بەسـەرت دا هەڵبدەم، ئەوەندە هەیە ئەڵێم هەوڵت داوە، سەرەتایەکی بەهێزت هەیە، شاعیرە هەرە بەرزەکـانی جیهـانیش سـەرەتایان لەتـۆ باشـتر نەبـووە.

بەڵام:

١. زۆربخوێنەوە بەتایبەت شیعرەکانی گۆران و کامەران و مەولەوی.

٢. بەرهەمی شاعیرانی بێگانە بخوێنەوە.

٣. بایەخ بە فۆرمی شیعر بدە وەکو وشە و کێش و پاشبەندی بەهێز.

٤. هەنـدێ هەڵەی زمانەوانیـت هەیە بەخوێنـدنەوە بەسـەر زمانـدا زاڵ ئەبیت.

٥. زۆر سـەرکەوتووی کەهەوڵـت داوە تەعبیـر لە تەجـروبەی دڵـداری خۆت بکەیتەوە.

٦. هـیچ زۆر لەخـۆت مەکە لەنووسـینا، وابـزانە بۆخـۆت ئەنووسـیت و زاتی خۆت لەیادبێ.

٧. ئازابە و دەربەستی زمانی خەڵک مەبە.

**ئیمزا عەبدوڵا پەشێو**

١٩٧١/٤/٢

ڕەنگبێ هەبێ بڵێن ئەدی بۆچی تا ئێستا وەک شاعیرێکی ناودار نەهاتوویتە پێشەوە؟ لەوەڵامدا دەڵێم: پرسیارێکی بەجێیە، بەڵام وەڵامدانەوەی لەم نووسینە کورتەدا ناکرێ!، ئەم هەویرە ئاوی زۆرهەڵدەگرێ چونکە بارودۆخ زۆربەی کات دژی ویستی من بووە.جگە لەوەش من خۆم لەڕاست شیعردا زۆر بەپارێز بووم، تا ئێستاشی لەگەڵدابێ نازناوی شاعیربوونم نەداوەتە پاڵ ناوی خۆم. پێم وایە هەندە ئاسان نییە ببیە شاعیرێکی چاک و ناوت لە پاڵ شاعیرە گەورە و سەرکەوتووەکاندا بخوێندرێتەوە. هەرکەسێ هەستێ و چەند شیعرێکی ناکامڵ بنووسێ و خۆی بەشاعیر بناسێنێ و پێی وابێ شان لەشانی نالی و مەحوی و کوردی و حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزاو هێمن و شێرکۆ و پەشێو و هتد دەدات، کارێکی نەشیاوە و دەبێتە حەشرەکەی حەزرەتی شێخی گەورە! . ئەوە یەکێک لە هۆکارەکانبوو. هۆکارێکی تریش بارو دۆخی کەسی خۆم هاندەر نەبوو بۆ بەچاپ گەیاندنی دیوانی شیعری تایبەت بەخۆم. جگە لەوەش دوای ڕاپەڕین من نامیلکەیەکی شیعریم لەکۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١لەمەهاباد بەچاپی دەستی، لەماڵی "سەییدیان"بەدەستی کوڕەکەی چاپکرد، بەناوی ( سروودی نەورۆزێکی تازە)، تەنیا شێست دانەشم لێ فۆتۆکۆپی کرد، هەرلەوێ لەمەهاباد بڵاوم کردنەوە. پاشان کەهاتمەوە، دوو سێ دانەم هێنابۆوە بەنیازبووم لەگەڵ هەندێ شیعری تر لەهەولێر دووبارە چاپی بکەمەوە، کەچی لەساڵانی حوکمڕانی کوردی و براکوژیدا وازم لەویش هێنا.چونکە ئەوەی من خەونم پێوەدەبینی، ڕێک پێچەوانەکەیم بینی . وادیارە قەدەری من وایە نە شیعر واز لەمن دەهێنێ و نە منیش پێم دەکرێ بە یەکجاری دەست بەرداری شیعرببم. ئێستاش وا بەو درەنگ وەختەوە ئەو دیوانە شیعرەم پێشکەش بەخوێنەران دەکەم، با وەک مێوانێکی ئێسک سووک لەدەرگەی ماڵەکانتان بدات، هیوادارم بەچاوێکی پڕ سۆز و بەخشندەییەوە بیخوێننەوە و دەرگای دڵتانی بۆ بکەنەوە، دوور لە تێڕوانینی حیزب حیزبێنە و بینەوبەردەی بێتامی سیاسی ناشیرین! کەخۆم زۆر بێزم لێی دەبێتەوە. من

تەنیا لەبەرەی گەلی کوردی چەوساوە و مەزڵوومم، بڕیاریشمداوە قەت ئەو سەنگەرە چۆڵ نەکەم. بێشک هەندێ لەشیعرەکانم لەهەندێکیان باڵاترو دڵگیرترن لەلای خۆم، بێگومانم لای خوێنەران و ڕەخنەگرانیشدا هەروادەبێ، چونکە هەندێک لەو شیعرانە، شیعری بەرگری و هەڵوێست و ئازاری ڕۆژانەی میللەتە، بەناچاری هەندێ وشەو دەستەواژەی زبری تێدا بەکارهاتووە کە تەمەننام نەدەکرد لەوجۆرە شیعرانە بنووسم و بڵاو بکەمەوە، بەڵام بێدەستی خۆم، ئەو زروفە سەقەت و ناڕێکەی وڵات بە سەریدا سەپاندووین، وای لێکردم بیاننووسم. هەرچەندە شیعر بۆ من خەمڕەوێن بووە بەڵام زۆر وەخیش مایەی سەرئێشە بووە بۆم . چ لە کاتی ڕژێمی بەعسی و چ لە زەمەنی دەسەڵاتی گوێمەدێی خۆماڵی. شیعرەکانیشم هەمەچەشنەن، فیکری و پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی و دڵداری ونیشتمانپەروەرین . هەندێکیشیان شیعری گەپ و هەڵوێست و بەرگرین، زۆربەیان لەم چەند ساڵەی دوایی دانووسراون، لەفەیسبوکیش هەندێکیانم بڵاوم کردووەتەوە، زۆر شتی تریش ماوە باسی بکەم، با جارێ ئەوەندە بەس بێ. هیواخوازم بەدڵی گەورە و چاوی لێبوردەییەوە بیخوێننەوە و هەڵی بسەنگێنن. سوپاس بۆ هەموو ئەوانەش کە هانییان داوم و هاریکارم بوون بۆ بڵاوکردنەوە و بە چاپ گەیاندنی شیعرەکانم. ئەمڕۆکە بەپێویستم زانی بیخەمە بەر دەستی ئازیزانم، تابچێتە ناو کتێبخانەی کوردی و لەفەوتان دەربازیان بکەم. پێش ئەوەی مەرگ بمگاتێ و شیعرەکانم شوونبزربکرێن. فەرموون لەگەڵ ئەو چەپکە شیعرانەم کەلای خۆم خۆشەویستن، هیوادارم جێی ڕەزامەندی ئێوەی ئازیز بێت...

هەر شادو بەختەوەر و گەشاوە بن.

هەولێر ٢٠١٨/٧/٢٦

# تۆران و دابڕان

## ئەوە یەکەمین شیعری منە

هەرچەندی لێی پاڕامەوە | بەو دڵەی پڕ لەزامەوە
بێ سڵ وەڵامی دامەوە: | "چیدی نەیەیت بە لامەوە!
ئیدی وەختی دابڕانە | پایزە و گەڵا ڕێزانە"
بە چاوی پڕ فرمێسکەوە | تێکەڵ تاسەو هەنیسکەوە
بە دڵساردی و پەشۆکاوی | زۆر بەعادزی و داماوی

بەرەو دواوە گەڕامەوە | پشتم شکاو چەمامەوە
یارەکەم بۆچی تۆراوی؟ | خوا لێت هەڵناگرێ گۆڕاوی
ئەو زیزبوونەت لە، سەرچییە؟ | دەردی دڵم دەرمانی نییە
من بێ تۆ ناتوانم بژیم | بێ پڕشنگی نیگاکەت، نیم
گیانە بادەوە لای دڵت | با نەگەچڵێ عومری گوڵت

پارە و زێڕ دادی دڵ نادا | خۆت لە دەرد و بەڵا لادە
بۆ نەهامەتی و غەمباری | دڵت بردم بە بێ عاری
بۆچی بێ سووچ بەجێم دێڵی | تەنها و سەرگەردان بەوێڵی؟
ئادەی پەشیمان بەرەوە | ئارامەکەت ئاشت کەرەوە
تۆ گەر یارێکی لە باری | ناشکێنی گفتی دڵداری

بێـــرەوە لای ئـــازیزی خـــۆت
گەر تـــۆ دووبـــارە بێیـــتەوە
دڵـــــم بــــــۆتۆ ئـــــاوێنەیە
تکـــا و نـــزام لــــێ وەر بگـــرە
توخوابـــا دڵشـــکان بەس بـــێ

دەزانـــی چەنـد ســووتاوم بـۆت؟
بەهـــــــارم دەگەشـــــــێتەوە
ئەو عەشــقەی مــن بــێ وێــنەیە
دڵ لە ســـەر پۆڵـــووی ئـــاگرە
ئـــارامەکەی خــۆت مەبەس بــێ

چـــۆن دەتـــوانی لەبیـــرم کەی؟
شـــێت و شـــەیدا و بـــێ قەرارم
تـــۆم لە یـــاد نـــاچێ تـــا مـــاوم
عەشـقی ڕاسـت قوربـانی دەوێ
تـــا ئەو دەمەی لە گـــۆڕ دەنـــرێم

عەشـــقی گـــڕدارم لەنـــاو دەی؟
تـــازە کەس نـــاکەم بە یـــارم
ئەی هێـــزی بینینـــی چـــاوم
ئـــاڵای بەرزە و قەت نـــانەوێ
هەر گـــۆرانی بـــۆ تـــۆ دەرێـــم

هەولێر ١٩٦٩/١١/٢١

## لەو ساکە بێ تۆم لە ڕۆڕۆم

گیانە خۆزگەم ئەو کاتەیە یارەکەی خۆم ئاشت بیتەوە
چاوم لەم چرکە ساتەیە باوەشت بۆم بکەیتەوە

بەرهەمی دڵ ئاگر دەگرێ توخوا زوو بیکوژێنەوە
وا ئارامی گیانت دەمرێ بیگەیێ و بیبووژێنەوە

بە ئەوینی پاک پێگەیی چۆن دڵت دێت بیفەوتێنی؟
چەند سە و بەدکارمان تێگەیی! کێ باغی گوڵ دەسووتێنی؟

بێرەوە لام قوربانی تۆم خێرا بمبەخشە یاری خۆم
لەوساکە بێ تۆم لە ڕۆڕۆم خوێناوی جەرگی خۆم دەخۆم

ئادەی پرشنگی چاوانم گرفتاری خۆت ئاشت کەوە
خوا دەیزانێ بێ تاوانم بڵێ هەڵسە خەونە ئەوە!

ئەوسا لە ئامێزێت دەکەم، هەڵدەمژم بۆن هەناسەکەت
کڕنۆش بۆخوای جوانیت دەبەم بۆ من بێ دەنگوباسەکەت

جا بچین بۆ شایی شێخانی بە بڕوای بە یەک گەیشتن
نەشمیل بە ساز و گۆرانی لە جیاتی فرمێسک ڕشتن

گوڵی دەسکردی نەورۆزم ئاوداوە بە خوێن و ئەسرین
تا دەرکەوێ چەند دڵسۆزم بە هیوای تۆم تا هەم لە ژین:

هەولێر ١٩٦٩/١١/٣٠

## ئاهی دڵم

وامەزانە کە درەنگ درەنگ، دێمە سەر ڕێت
خۆشەویستیت ساردبۆتەوە و گیراوە جێت

وا مەزانە گەر جار جار بۆ دیدەنیت بێم
عەشقم ڕوو لە نەهاتە و ڕەنگبێ ئیدی نێم

تەنیا گیانە لە بەر پارێزگاری ئابڕووت
ڕێکخستنی زەماوەندی دڵی سڕبووت

نەك ببمە کۆسپێک لەڕێگەی بەختەوەریت
نەك بە ئاهی دڵم، گوڵم هەڵبوەریت

تا مابم ئاسوودەیی و شادی تۆم دەوێ
بێ تۆش بم هەر دەخوازم ژینت سەرکەوێ

گەرچی لە داخی دووریت دڵ قەت نەسرەوێ
با بە خەیاڵ هاودەمی گیانیت بم لەوێ

تکای دڵمە، ڕێ نەگری لە بەشدار بوونم
بۆ ئاهەنگی بە بووک چوونت، گیان دەرچوونم

بە خوا دەبێ کۆڕێکی خۆشت بۆ بگرم
یادەوەریت، بەرز ڕابگرم تا دەمرم

جا با ئەشکی شین و شاییم تێکەڵاو بێ
ژینی پەستیش لە پێشوازی منی لاو بێ

هەولێر ١٩٦٩/١٢/١٧

## هەلپەرستی

شــیرینی مــن لە کــوێ فێربــووی، تــۆ هەلپەرســتی
وەک فەرهــاد خســتمتە کێــوان، خــۆ دەمپەرســتی

بۆجێت هێشتم بە غەریبــی و کەساســی و پەســتی؟
کەخــۆم پێشــەنگی لاوان بــووم، بۆخۆشەویســتی

ئــاخۆ کــاڵبووی بێســتانی پێنەگەیشــتوو بــووی؟
لەمەیــدانی عەشــق و جــوانی، بەهەڵە چــوو بــووی؟

نەتـــدەزانی ئەویـــن دائـــیم قوربـــانی تیـــایە؟
وەفـــایە شـــەرت و پەیمانـــی هەتـــا هەتـــایە؟

وەک گـــڕی دۆزەخە عەشـــقی جوانـــان لێـــرانە!
گەر یـــاران لە ڕێـــی دڵ نێـــنە مەیـــدان شـــێرانە!

بەسەرســـەختی بەســـەر گیـــانی کڵـــۆڵ ســـەرکەوتی
یـــا بە ئەنقەســـتی هـــاتی بە ســـەر دڵ تیـــژ ڕەوتـــی

بێ دەربەستی لەژێر ســایەی خــۆ ویســتی خەوتــی
بــێ بەزەیــی بــووی گوێــت نەدا، ئاکــامی چەوتــی

جـــا چیـــت داوە لە برینـــی قـــووڵی هەژاری!
دڵ پێکـــراوە بە پرشـــنگی چـــاوی ڕاوکـــاری

گــوڵم هەر خــۆت، نــاوە نــاوە، ڕێگــات پــێ دەدام
سوێندت بەخوای جوانی دەخوارد: دەتگوت بەوەفام

کـاتی هەڵپەڕکــێ و ئـاهەنگی، جەژنـــی نەورۆزان
هەربەدواتبووم، هەند خولیـاتبووم، شـێت و سـەرگەردان

لە بیـرتە، سـڵاوی چێشـتانان، بەی بـای ئێـواران
سـەر وەختـی جێـژوان و گەڕان، پیاسـەی بـن داران

زوو زوو بەمـــاچی هەوایـــی کەدەتنـــارد لە دوور
لە پەنـــجەرەڕا دەتخســـتمە، ئەو دیـــوی ســـنوور

ئەندێشـەی ڕووت تـێکەڵ دەبـوولەگەڵ بەژنـی ژوور
دەبـــووە ئـــاوێزانی گیـــان و گەردنـــی بلـــوور

منـــت کـــردە وشـــکە ســـۆفی تـــا بتپەرســـتم
گیـرۆدەی نـازو فیـزت بـێ، گشـت هەسـت و نەسـتم

ئەی ســـەرچاوەکەی کانیـاوی ڕوونـی هەڵبەســـتم
هێشتاش بەو ماچەی سەر کوڵمەت لێدراو و مەستم

بـــێ تـــۆ غەمبـــار و بـــێ هێـــزو ڕوو لە شکســـتم
بەم دەســـتبەردانە زاڵـــمانەت، زوو پەکـت خســـتم

بـۆ وات پـێم کـرد ؟ خـۆ منـی لاو زۆر بە دڵپـاکی
تۆ لەیلا و خـۆم مەجنـوونی تـۆ بـووم بە بـێ بـاکی!

گیانی زۆرداری تۆم پەرست، ڕاست یەخسیرت بـووم
ئەی هەلپەرست چـۆن وا خێـرا مـن لەبیـرت چـووم؟

هەولێر ١٩٦٩/١٢/٢٨

## پرسیاری ئازار؟

سەرما و تۆفانی زستان بێ یارم، کەی دەبڕێتەوە؟
فرمێسکی چاوی چاوەڕێی یارم چۆن دەسڕێتەوە؟
کەی گریە و ڕۆڕۆ باڵی ستەمی دەکێشێتەوە؟
دەبێ ڕەشەبا بە ڕووی بەدکاری هەڵگەڕێتەوە؟
تاکەی دڵەی وێڵ، بەم دەشت و دەرە بسووڕێتەوە؟

کۆمەڵی نەزان کەی گرێ کوێرە دەدۆزێتەوە؟
کەی هەستی ناسک بەگوێی ئارامدا دەچرپێتەوە؟
چۆن هیوا و ئەوین بە پشتی برین دەپەڕێتەوە ؟
کەی گوڵی نەورۆز خونچەی ژاکاوی، دەگەشێتەوە؟
دەشێ پێکراوێ تیغی ژەهراوی لە بیرچێتەوە؟

ئاخۆ دڵ دەبێ هەر لە گریان بێ ونەحەسێتەوە؟
کەی بای بەهاردێ، شەختەی دڵی یار دەتوێنێتەوە؟
خوایە وەڵامی پرسیاری ئازار، کەی دەدرێتەوە ؟
گەرچی ڕێم دووره، بەڵام تەم دەبێ بڕەوێتەوە !
با لەڕێی یاری شیرین گیان دەرچێ و نەگەڕێتە وە !

هەولێر ١٩٧٠/١/١

## نزگره*

نـزگــــره و ئـــاهی دڵـــی بـــێ تـــاوان
هانـــای هێنـــا بەر پرشـــنگی چـــاوان
کەچـی بـێ ئاسـار دڵـی جـێ هێشـتم
ژیـــنی ئـارامـــی کـــردم بـــە گریـــان

١٩٧٠/١/٣٠

## هەتوان

نـــامیلکەی شــیعرم گەر گەیشـــتە تــۆ
تێـــر بیخوێنـــــەوە بەیـــادی جـــاران
بـــا بـــۆ پرشــنگی چـــاوان بـێـتـــە گــۆ
ببـتە هەتـوانی عەشــقی بــێ دەرمـان

١٩٧٢/٩/٣٠

(*) لە ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٧٢ی گۆڤاری هەولێردا بڵاوکراوەتەوە.

## خەونی باوەش

دڵـــم ســـوارە و لە ڕێـــدایە بـــۆ ســـەر کێـــوی
هەڵمژینـــی شـــیلەی دەمـــی جـــوان بزێـــوی

دانـــــامرکێ کـــــوورەی دەروونـــــی زامـــــداریێ
وڕێـــنەی دەســـت لە ملانبـــوونی بەژنـــی یـــاریێ!

مـــاچ و مـــووچی ســـینەی ئـــاوێنە و گەردنـــی
ڕێبـــوارێکی پشـــوو ســـوارە، یـــاد کردنـــی

شـــەیدا و تـــامەزرۆی نیگـــات هەر چـــاو لەڕێیـــە
عەوداڵـــی خەونـــی باوەشـــی یـــار لەیلێیـــە

حوزەیران ١٩٧١

# نێرگزی ژاکاو

پرشـــــنگی چـــاوەکەی، ئـــارامی دڵشـــکاو
ئەی پەرچەم خـــــاوەکەی بەهەرزان نــــرخێنراو

مـــانگە گیـــراوەکەی دڵــــداری بـــاڵکراو
نێرگـــزی ژاکـــاوی بەردەم بـــاو، جـــۆگە ئـــاو

گلێـــــــنەی دزراوی منـــــــی جەزرەبە دراو
ڕەنـــگ زەردی بە عەشـــقی پـــاک خەتابـــار کـــراو

شـــەتڵە ڕەیحـــانەکەی لە ڕیشـــە هەڵکێشـــراو
مەعشـــوقە ڕەنـــدەکەی نـــا بەدڵ بەشـــوو بـــراو

بەو ئەڵـــقەی جەرگبـــڕ، زنجیـــری کـــرد دەســـتت
ســـووتاندی بـــاغی پـــڕ لە میـــوەی بەهەشـــتت

ســـەر پیکـــی ئـــاواز و شمشـــاڵی نووســـاندم
بـــۆم نەبـــووی بەو بـــووکەی خەیـــاڵی نەخشـــاندم!

ئـــاخۆ چـــۆن دەتـــوانی بـــژی بـــێ مـــن لەو لا؟
ئـــــارامی دڵـــــت وا بە تەنهـــــا گیـــــان دەدا!

ئەو ڕۆژە، پەیمانـــت بە دڵـــدا خـــۆت ویســـتت
تـــا مـــاوە هـــی تـــۆ بـــێ گیـــانی خۆشەویســـتت

ئـــاخ چەنـــد زوو لـــێم ونبـــوو ڕوخســـار و پێخوســـتت
واشـــێت بـــووم بەجـــادووی چـــاوی بـــاز و مەســـتت

بێگومـــان هەر چرکەیەکـــی پـــێکەوە بـــوون
هەرســاتێکی دەســت لەملانــێ و بەرە وپیرچــوون

گەنجیـــنەی زێــڕ و ئەڵماســـی دونیـــا دێنـــێ
غەمـــــی دڵان لە بـــــێخەوە دەردەهێنـــــێ

گیـــانە ئەوەی شـــیرناتی تـــۆ دابەش دەکـــا
پێکـــی مەرگـــی هێـــواش بـــۆ گەرووی خـــۆی دەبـــا

لەچـاوی تـۆم، گیـانەکەی خـۆم، گـوڵەکەی تـۆم
لەچـاوی خـۆم، گیـانەکەی تـۆم، دڵەکەی خـۆم

لە ســـــایەدی و پێشــــوازی بەری بەیانـــــا
لە سروەبـــــای فێنکــــــی دەم ئێوارانـــــا

لە نـــازی پیتیـــی هـــۆنراوی وەختـــی ژوانـــا
لە ئـــاهی هەناســـە و چـــرپەی ســـاتی دوانـــا

لە پەرســـــتگای ئـــــارامی کەنـــار یەزدانـــــا
لە باوەشـــــی پـــڕ لە ســـۆزی هەرزە ژیانـــــا!

لەنـــــاو تـــــاریکی شـــــەو، ڕۆژ بـــــووین
بـــۆ نـــاخی ئاســـمان هەڵـــدەچووین!

ئەوەنـــــدەی کـــــە پـــــێکەوە بوویـــــن
لە گـــــوڵزاری خواوەنـــــد دەچـــــووین!

هەولێر شوباتی ١٩٧١

## پاشای نارموا

"له شانۆگەری کۆمیدی پاشای زۆردار
له نەورۆزەکەی شەست و نۆ
دەوری خزمەتچیم دەبینی منی هەژار
له سەر شانۆ !
یاریشم وەک تەماشاکەر ئامادەبوو پۆشته و پەرداخ
تـێـرو پـڕ بە من پێـکەنی منی گیـرۆده و دڵ پڕ داخ!"

ئـاهەنگێ بـوو
بـەهاری هـەزاران لاو بـوو
نەورۆز بوو هەر بابا بـوو بـۆ خۆی لـەڕاو بوو!
منیش وەک ئەکتەر له نواندن، بەشدارێ بووم
خزمەتچی کۆشک و بن دەستی زۆردارێ بووم
ماستاوی داوا کـرد مـاسـت و ئـاوم هێـنـا!
فـەرموو یەک یەک بیـانخـۆوە
گـەورەم جـا خۆت بشلەقێنـە!
پاشا گڕی گرت قیڕاندی: قۆڵبەستی کەن!
بیگرن، تێر و پڕی لێدەن، زیندانی کەن!
من لەوساوە، بڕیارم داوە وەک کاوە
بگرمە بەر ڕێبازی سەختی چەوساوە!

ئەوسات، نیگات چۆنی بینیم من هەر ئەوهام
دژی پاشای ناڕەوا هەر وا لە ڕێگام
بۆیە ئاوا بە ناکاوی خۆت لێ لادام؟
کەچی زۆر بڕوام بە تۆ بوو، منی ناکام!

وا تەزانی وەک ئەو هەژارەم! ژینم دڕکی زۆری تیایە
ئەو ئەکتەرە خزمەتکارەم! خۆشت لێم بووی بەم پاشایە!
پەشیمانیت لەم ئەوینە ئاگرینەم، ناڕەوایە
دەست هەڵگرتن لەم هەناوە پڕ لە خوینەم، بێ مانایە
تۆدەزانی، من لەو عەشقەت چیتر شک نابەم بەوخوایە؟
خواش دەزانێ، نیمە پایە و کۆشک و قەمەرەو سەرمایە
ئەوەی هەمە چەند شیعرێکی، بێ سەروپای سەر بە تەمە
سەرگوزشتەی عاشقێکی، زوڵم لێکرای دڵ پڕ غەمە!

هەولێر ١٩٧١/١/٢٠

## شیرین

خولیای بینینت دڵ دەسووتێنـێ
چاو پێکەوتنێکت دونیا دەهـێنـێ
هەندەی ئازاری ئەم دڵەم دەدەی
بە جێم دەهێڵی و پەرگەندەم دەکەی
بێسوودە تا دێی، خۆشترم دەوێی
بەهەشتە ئەو جێی نازدارم لەوێی!
شیرین لەخەونێش بـبـیـە مێـوانـم
خـۆم فەرهادەکەی کەژ و کێـوانـم!

هەولێر ١٩٧٠/٨/١١

## تـاڵاویی بێ وەفایی

"بۆ ئەو شۆخەی شەیدای کردم، لەدەستم ڕۆی
لە گەڵ سروەی بە یانێك خۆی، لێم ونکرد ڕۆی! "

**دڵبەر:**

بڕۆ لاوکۆ، دەی زوو بە زوو، پەشیمانم بێ سێ ودوو
گفت و پەیمانم لە بیر کە، دڵ بە یارێکی تر ژیر کە!

**دڵدار:**

جوانێ نەکەی جێم بهێڵی بێ هۆ پەڕەی دڵ بکێڵی
بێ تۆ ژین هیچ مانای نابێ بەزەیی خوات بەدڵدابێ

دڵبەر:

له بـیـر بـەوه خۆشەویستـیـم له مـرۆوه عاشقی تـۆ نـیـم
دەست دەکەم بە ژیانێکی خۆش چیدی نابینم خەونی بۆش!

دڵدار:

توخوا ئەمجارەش وەرەوه شێت وشەیدای خۆت ئاشتکەوه
یارەکەم دەی بێـرەوه لام نەمام بەو عەشقەی تۆ سووتام!

دڵبەر

له مەولا قەت نـاتدوێـنـم جۆڵلانـەی خـەم ڕانـاژێـنـم
خزمێک هاتیـتـە داخوازیـم بەختـم هەستاوه و بەو ڕازیـم!

دڵدار:

تا ماوم هەر چاوەڕێـتـم سەوداسەری تۆ بووم شێـتـم
هەی بێ وەفا بۆ جێتهێشتم؟ تاڵاوی مەرگت پێ چێشتم!

دڵبەر

لێمگەڕێ خۆم نافەوتێـنـم ڕووی گەشاوەم نـاژاکێـنـم
لەگەڵ تۆی هەژار بێ بەشم بـۆ هەمیشه بەخت ڕەشم!

دڵدار

ئازیـز کت و پڕ گۆڕاوی زێڕ و زیـویان نیـشان داوی
درۆ لەگەڵ عەشقت بکەی دۆزەخ بۆدڵت دادەخەی!

هەولێر ١/١٢/ ١٩٧٠

# چیرۆکی عەشقێکی ئەبەدی

+" کە گازانـــــدەم لە یـــارە ئـــــازیزەکەم کـــــرد
بـــۆ بـــێ گونـــاح دڵـــی منـــت بەم دەردە بـــرد؟"

+ "فەرمـــووی هەرگیـــز نەگـــۆڕاوم لـــێم قەومـــاوە !
دڵ هەر وابەســـــتەی تـــۆیە و ڕێـــم لێگیـــــراوە

تـــو خـــوا گیـــانە مەڵـــێ منـــت جـــێ هێشـــتووە!
زوخـــاوی دەردی دووریمـــــت پـــێ چێشـــــتووە!

بینـــــای چـــاوم ! هەمـــــووی تـــاوان لەم و لەوە!
عەشـــقکوژی ! ســـووچی عەقڵـــی؛ تـــاری شـــەوە!

تـــۆ چـــی بڕیـــاردەی ئامـــادەم بە دڵ و گیـــان
سەریشـــم تێچـــێ هەر دەیـــکەم ڕۆحـــی ڕەوان!

وەرە گـــوێ لە گرفتـــی یـــاری خـــۆ ت ڕابگـــرە
دەیـــان دەردو ســـەدان مەینەتـــیم لـــێ بکـــرە!

ئـــارام گیـــان بە تـــاقی تەنیـــا، چـــیم پـــێ دەکـــرا؟
ئەنـــدامی خێزانـــی خۆشـــم، چـــوون بە گژمـــا!

جگە لەو خزم و هاوسێ و بەدکارەی سەر ڕێ
کۆنە خوازی فیتنە گەڕیش هەر لێی گەڕێ

تەنیا لەبەر ئەو عەشقە جوانەی من و تۆ
بێ ئابڕوویان دادەنام بێ هیچ گفتوگۆ

بڕوات بێ تا مابم هەر تۆی خۆشەویستم
ئیدی کەس ناچێتە ناو دڵی شکستم

دەست لەملانبووین بۆ بە هەشتێ
ئەندێشەش نەیدەگەیشتێ

گەر هێشتاش پێم بڕوا ناکەی، تریەی دڵم بخوێنەوە
گیانیش فیداتکەم تێم ناگەی، خۆم لەناو دەبەم بەم شەوە!"

+" جا بە پەلە و خەمناکی لێی هاتمە وەڵام
تۆ نا، من ببمە قوربانی! عەشقی ناکام!

ئازیز توخواکەی بمبەخشە لەوەی گوتم !
با بەم عەشقەت بمرم تۆخۆشبی! من چەوتم!

هەرگیز باسی خۆ سووتاندن نەکەی گیانە
گەر چی زوڵمیان لێکردین، هێشتاش تاوانە!

نـــــــــامەویٚ قەت لە ئـــــــاڵۆزی دا بتبیـــــــــنم
کەژاوەی مەرگــــــی مەعشــــووقی خـــــۆم ڕازێـــــنم!

دەمویســــــت هەرچـــی خۆشــــی هەیە پێــت ببەخشـــم
گیـــان و دڵـــم، تێکــڕای هەســـت و نەســـتی خۆشـــم

بە ناچـــاری دەســـــتم بـــرد بـــۆ گیرفـــانی خـــۆم
دەرم کـــرد نـــامەی بـــۆن خۆشـــی گـــوڵی شەوبـــۆم

بە شـــــــین و زاری دامەوە دەســــــــتی یـــــــارم
وێــــــنەی ئەو نـــــازدارەی پێـــــوەی گرفتـــــارم!

بـــۆ دواجـــار نـــاوچەوانی ئەو گـــوڵەم مـــاچ کـــرد
کڕنۆشـــی عەشـــقی ئەبەدیـــم بـــۆ دڵـــی بـــرد ! "

هەولێر ١٩٧١

## عەباو پێچەی داپیرە

-داپیـرە ساتـوەخـتی بوونی  خـەڵکی دەوروبـەری بـیـنی
عەبـای ڕەشیـان لەبەردابوو  لایـان  فـەرمایشـی خودابـوو
ئەویش عەبای ڕەشی پۆشی  چەشنی قەل لەشی داپۆشی
کاتێ  ڕۆڵەی ئەویش بیـنـی   زۆر بە زەلـیـلـی و غەمگیـنـی
هەر وەک ئەوان  زوو بـوو بە ئایین و خوویان
پەچـەی وەک دەڕاب  ئاسایان  دا بە ڕوویـان

+تازە ئەوەی ئەو کفنە ڕەشە داکەنێ
نابێ ئیـدی  لێرە  بـژی و پێبکەنـێ!
بێشک ئەوەی لێی لا بدا بێ ئابڕووە!
لەدەستووری باپیرە گەورەی دەرچووە!

دەی گۆشاوگـۆش !کیژۆڵەی عاشقی دڵخۆش
جگەرگۆشـەی  بێ عەبا و پێچە بێ  سەرپۆش
هەرزەی بێـخـەتا پـڕ لەجۆش   کیژۆڵەی دڵساف و کەم هۆش
ڕیسوا و شوون بزر و ونکـەن  جەرگی لەتلەت و کونکونکـەن!
بـۆ دۆزەخییان  بەڕێ بخـەن!  نەکەن  لـەم  ڕێـگایـە لادەن
بەسـەر لاشەی جوانـان بـازدەن
زەماوەنـد بـۆ مەرگیـان سازدەن!

(داپیره بە دەرزی و داوی، حوکمی چاوی
درووی بۆ جەرگ و هەناوی، بەهەشتاوی
پێچەو عەبای کردە سەری پڕ بە بەری
ڕۆڵەی مێیەی چ ناشیرین بێ چ پەری
پێی وابوو کە بەم لەشپۆشینە دەپۆشرێ
پەردە لە سەر حەزو کردەی بەد دادەخرێ

لەکوێ باوی عەیبەوعەبای نەگریس مایـە؟
کوا پێـوەری جوانی و حەیای ژن ئەوهایـە؟
پـێـچەو عەبای بـیـری کۆنە خواز و چڵکن
کەی شایستەی ڕێـزو بەهای دایک وخوشکن؟)

هەولێر ۱۹۷۰/۲/۲۰

* حوکمی چاو: هێزی چاو

## ئەمشەو بەگوڕ داگیرساوم

بێ یارخۆم یەڵـدایە ئەمشــەو  لە چلـلەی هـاوین زسـتانە
شیوەنی شەیدایە ئەمشـەو  سەرتاپام لە خـوێن خەڵتـانە

بە مەرگـم هـەرزانــە ئەمشــەو   دەردی دڵ هێنــدە گـرانە
یـادی دەسـت بەردانە ئەمشـەو  قـوڕ  پـێوانی  دڵـدارانە

لەوســاکە یــار لــێم تــۆراوە  خەو و خــۆراکم زوخــاوە
چەرخی گـەردوونێ گـۆڕاوە  گەرداوی حەشرێ هەسـتاوە

هـۆ مانــگ ورۆژی جــارانی خۆشــیم لەکـوێی؛ بگەڕێــوە؟
تاقە ئەستێرەی ئـاسمانی  بەختم؛ سەر لە نوێ هەڵبێـوە

شــەوقی پرشــنگی ڕوخســاری بــێ وێـنەت داڕێــژە ئێـرە
زامــی ئــارامی بێچــاری ئەو چـاوەت ســارێژ کە، خێـرە!

لەدووریـت وەک بـابەگوڕگوڕ  ئەمشـەو بەگـوڕ داگیرســاوم
ئاگری عەشقت وەک تەنوور  مەشخەڵی هەڵچوو لەچاوم!

وا دڵـە کـۆست بارەکەی مـن   دەمرێ بۆ دیدەنیت جـوانێ
بەشایی دۆست کوێری دوژمن  دیسانێ بـۆم وەرە ژوانــێ!

نەختێ بەم گفتە پاراو و هە نگوینەت بملاوێنەوە
وەرزی غەم لە باوەشی ئەم ئەوینەت بڕەوێنەوە

بەم پەنجە ناسکانەت نەرم بمشێلە نۆرەی وەفایە
شەمی خەیاڵدانی شیعرم، دێوانەی بەزم و سەفایە!

گەرلەڕێی خوا جارێک بەناو خەونێکمدا هاتی و ڕۆیی!
دڵ بخافڵێنی نەک ناکاو تووشم بێنی دەستخەڕۆیی!

بێییت و ئۆغرکەی لەم خەونەم ئاوابیت بێ ماڵئاوایی
گیانم ئەم جەستە کونکونەم بەجێ دێلێ بە تەنهایی

هەند شپرزە و خەستە حاڵم دەمکوژێ ژینی بێ تۆیی
بگە هانای مەزڵووم دڵم بەداخی ئەو عەشقەت ڕۆیی!

کەرکوک هاوینی ١٩٧٢

# تینووی گۆڕین

تینووم، تینووی تیشکی چاوو جوولەی ئەو زارە هەنگوینەی
برسیم، برسی لەنجەی گیان و گەڕانی ناو باخی سینەی

دوور لە تۆم خەم هێزی لە گیانی شەکەتی من بڕیوە
دڵ بێ ئۆقرە و دەربەدەرە بۆ هەوارگەی تۆ فڕیوە

گیانم بە گژ گیانکێشی ئەم نازدارە بێ نازەم دادێ
بە گژ هەر تاقمێکی کەم کە بە گژ ئەم ڕازەم دادێ

هۆشم بە گژ بە شووودانی کچ بە زەبری خەنجەر دادێ
بە گژ بەدکار و جەللادی دڵداری بێ مەفەر دادێ

شەیدای دۆزینەوەی چارەم بۆ ئاشقانی ئەم ژینە
تینوێتیم دەشکێ و باڵ دەگرم، بە سازدانی ئەم گۆڕینە

تا ئەڤیندارم دڵشاد بێ بە سارێژی ئەم برینە
هەرلە شایی و زەماوەند بێ گەنجی هوشیار و بێ کینە

دەردو ناسۆر بە یەکجاری بارگەوبنەی تێکنێ و هەڵێ
با بە نەفرەتکەین بەدکاری تا خۆری ئاشقان هەڵێ

خوایە ئەو ڕۆژە کەی دادێ ؟ وڵاتی دڵم ڕزگاری بێ
هەولێر شاگوڵی شاران بێ قەڵای بەرزی دڵداری بێ

هەولێر کانوونی دووەم ١٩٧٢

# بەستەی عەشق

یــــارەکەم زێـــدە ئـــازیز بـــووی، لە نـــاو دڵـــی گرفتارمـــا
شازادەی شـیعری بـێ فیزبـووی، لە دەفـتەری پـڕ شـاکارما

بـۆ لەم شـارە بە غەریبـی جێـت هێشـتم، پەیـمان وانـابی؟
خۆتــۆ گفتــت بە دڵــدا بــوو؛ لە گەڵ منــدابیت تــا مــابی

ئەو دەستە ناسـکەی بەرایـی دەتخسـتە پەنـجەم لە شـایی
تەلی کەمـانجەی پچڕانـدم، ئەڵـقەی زێـڕ، بڕیـاری جیـایی!

تاهەم لە سەر ڕێـت دەوەسـتم، بـۆ سـەیری ئەو بـاڵا جـوانە
ئێشـــکچیم بە دڵ ناوەســـتم، قوربـــانی تـــۆم بە چـــاوانە!

چـــاوم وێڵـــی پـــڕشنگێکی دیــدە مەســـتی ئەفســـوونکارە
گـــوێم وشـــتی پێکەنینێکـــی ڕێـــکەوتی دیـــداری یـــارە!

لە گیانی خـۆت ڕا ببیـنـــە ئەوشەیدای تۆی پەرست دوێنێ
هێشتاش لەشین و گریانە بەستەی عەشقت بۆ دەخـوێنێ!

ئـــەم بـرینە کـولاوەی مـــن بەردەوام خوێنی لێ دەتکێ!
فرمێسکی ئەو دوو چاوەی من بە هیچ بەربەستێ ناوەستێ!

سوێندم بە شەوقی ڕووی گەشت تا مـاوم هەر بـۆت دەنـاڵم
لەو دنیاش بێ تۆبم بەهەشـت دۆزەخە و بـۆت لە ئەحـواڵم!

هەولێر ئاداری ١٩٧٣

## بووکی داماو

(پێشکەشە بەو نەو بووکە نابەدڵ بەشوودراوەی بەچاوەکانی پێی گوتم خۆشم دەوێی! )

ئەی شاجوانی نێو شەوەزەنگ
جوانکیلەی سەرگەردان دڵتەنگ
تریسکەی گوڵی ڕەنگاوڕەنگ
یاری درەنگ وەخت وبەسەنگ

که چاوەکانت هەڵدەبڕی  وا بە حەسرەت و کەساسی
ئەوها گوناح لێم دەڕوانی  هەروەک بڵێی بۆ من خاسی!
پەری لە تاریکی خنکاو!  بێ چرا و یار !
گیانی پتر لە تۆم سوتاو بۆ تۆم بیمار!

خەیاڵ دەیکاتە میوانی   ئەندامی ناسکۆڵە و جوانت
تێر نابێ لە ڕاموسانی، بوکی نەو، سەر وەختی ژوانت
سوڕ بزانە کە نالوێ بۆم  بێمە پێشوازی ئەم عەشقە!
بەدوای ئارەزووی خۆم بڕۆم، دەبمە سۆتەکی ئەم زەوقە!

وەک باخی سێوت دەیەوێ  جەستەی بزێوت دەیەوێ
وەک کوڵم و لێوت دەیەوێ   گیانی پەشێوت دەیەوێ
بە پیک و دووزەلە و تەمبوور   نەغمەی بلوور، ئاویان بدەم
قافیەی شیعرێکی بێ قسوور بۆتۆی مەغدوور، بەوان ڕێکخەم!

چاوبازی دەم نوقڵ و قەشەنگ
نێچیری دەم گورگ ونەهەنگ!
دەزانم کە بەناڕەوا کەوتیەداوی!
لای ملهوڕێکی دەسڕۆی وا لـەم کونجـەدا، بەند کراوی!
هەر وەک ئاسمان و ڕێسمانە خـوا دەزانێ چـەند تاوانە
تۆی جوان دەگرێ لە باوەشیاو ناگرێ نرخی ئەم چاوانە!
بێ ئـاگایـە لە نـاسـۆری گوڵەنـدام لـەم جـۆرە ژیـانــە
تێنـاگـا لـە ئـاهو نـاڵـە و ژانی ئـەم جـەرگ سـووتـانـە!

ئەی فریشتەی پشتگوێ خراوم زۆر لێکراوی دڵشکاوم
منی دڵ نـەرم و تامـەزرۆش لەم نـێـوانـە تێـدامـاوم!
بـێـدەستی خۆم وەک پەروانـە دەگەڕێم چەشنی دێوانە
بـۆ تـەوافـی ئـەم چـاوانـە وا دوو دڵ و پـەشـــۆکـاوم
بە عەبـداڵی، خول دەخۆم بە دەوری ئەم بەهەشتە جوانە
بێ ویستی خۆم، لـەدەریای ئەندێشەی بێبن دێم و دەڕۆم!
من لە جیـاتی تـێـئـاڵان و ماڵـوێــرانی تـۆش لـە ڕۆڕۆم
شەڕابی خەم دەخۆمەوە و سێ ژەمە نـانی خـەم دەخـۆم

باڵندەی پەڕ و باڵکراو، خاسەکەوی قوڕگی نەهەنگ
دڵنشـــینی ئـــاژاوە و جـەنـــگ
بـــووکی هەش بەســـەرو دامـــاو
ئەشـکی تاسـاو لە ڕووی گوڵڕەنـگ
بـــەژن و بـــاڵا چـــەشنی لاولاو
پـــاییزی ژاکـــاو، شـــیلەی هەنـــگ!

منـی هەژار چـیم لەدەسـت دێـت؟ وا کـار لە کـار تـرازاوە!
کڕیـاری بـاوکی چاوبرسـیت لە جەسـتەی خـرپن ئـاڵاوە!
ویسـت و ئـارەزووش بە تەنهـا، دەربـازت ناکـات لەم داوە!
دڵگرانـم کە ئـەو داوایەی دەیـکەی خەیاڵێـکی خـــاوە!
هەرچـی بـکەی ؟ئەو کـۆرپەڵەی بەڕێـوەیە، هـی ئەو بـاوە
مەگەر خـودات پەنـات بـدات، ئەگینـا تـازە قـەومـاوە!
ئەم ژیـانە نـا شایستــەی لـێـرە بە سـەرتا سەپـاوە
بەنەریتـی چەرخـی بەردیـن دەمیـان لە گۆشـتی تـۆ نـاوە
دژی هەناســەی ئــازادین، مەرگیـــان بە خەڵات دانـــاوە
تـاکەی دەوامـی هەبـێ ئەم عەقـڵە کـۆن و بە جـێماوە؟
دەستەی عاشقان دەی تووڕەن! بیری پووچەڵ وبەرمـاوە!

گوندی گرتک ١٩٧٢/٥/١٤

★ سۆتەک :، سووتووی جگەرە

## دەنگی یەکبوون لە دەی شوبات☆

درک و داڵ چقـڵ و چزوویـان شـکا، چەمـا بە یەکجـاری
چاوی پیسـی" سـێوو دوویـان" کوێربـوو، ڕژا، لە داخبـاری

کەدەنگـێ هـات مـوژدەی هێنـا لە ئاسـۆی کوردسـتانەوە
هەواڵــی یەکبــوونی گەلــی ڕژانــدە نــاخ و گیــانەوە

پەرتەوازەیی لە وڵات بە تەواوی ڕەوانــــــــــــــدەوە
فێنکـایی بە دڵـمان داهـات ئەم مـیللەتەی حەسـاندەوە

دەی شـوبات بـوو کە ئـاواتی هەمـوو یـاخود زۆربەمـان بـوو
بــۆ دوارۆژی پڕشــنگداری خۆمــان و بــۆ کۆرپەمــان بــوو

لەمەو دووا گشـتمان دەبیـنە خـاوەن کوردسـتانی شـیرین
ئەو درووێـنەی کەوا ئەیکەیـن پەرێـزی پـاگژ ڕائەگـرین!

ئەو تەقەڵایەی کە ئەیـدەین لە پێنـاوی گشـتی ئەیکەیـن
بـۆ بەژەوەنـدی هـیچ تاقمێـک پەلامـاری یەکـتر نـادەین !

چەند خۆشحاڵم کە گەل پێکرا بـەرەو ئاسـۆ هەنگاو ئـەنێ
جارێکی تـر ڕێگـە نادا دوژمن شـاد بێ و پێی پێبکەنـێ !

هەولێر ١٩٧١/٢/١٠

☆ تێکەڵبوونەوەی باڵی م، س جەلالی لەگەڵ پ، د، ک مەلایی.

# ژانی برینداریکی شەیدا

ئەو شیعرەم لەمیهرەجانی شیعری (کۆمەڵی هونەرو وێژەی هەولێر) لە هاوینی ١٩٧٣ لە هۆڵی گەل خوێندەوە، هەرچەند لەشیعرە بزر بووەکاندابوو، بەڵام لای هاورێیەکم مابوو، داوامکردەوەو ئەویش بۆی گەڕاندمەوە.

خوشـــکەکانم، براکـــانم

گەردەســتم خســتە ناوڕیشــەی زامەکــانم، زامەکانتــان

گەر پێمگــوتن کوردســتانم کوردســـتانی زگ ســـوتاوتان

خـراوەتــە نــاو زەڵکــاوی کـێـمی نــاو لەپـی بــرژاوی

دەســتی پـڕ ژان و ئـازاری، ڕێـژنە چەپـڵەی بەرهەتاوتـان!

نــارەحەت و تــوورە مەبـــن! بـــەشیعرەکەم پـێمەکەنن!

بگـرین بـۆ عەقڵـی سـەقەتی، خوراڤـاتی بـاوکی باوتـان !

ئەگەر نــرکەی شیعرەکانـــم

پێیـان نەکـرێ، پەردەی گـوێی دوژمـنە هەرە گەورەکـانم

بـــەشاڵاوی ڕقیـــان بـــدڕن

ئەگەر چەقـــۆی دوو دەوی پرسیـارەکـانـــم؟

بۆیـان نەلـوێ زمـانی شـڕی درۆزنە گەورەکـان بـبـڕن

دیســانەکە زویـر مەبـــن، بـــەشیعری مـــن پێمکەنـــن

بە زریکــــەو داد و فیغانـــم، بە هـــاوارم ڕامـەچەنـــن!

قرقرتۆک:بینەقاقا

چـــونکه هێشـــتا ڕســـتەی هەســـتی برینـــدارم
لە گەرووما بـــە ئـــاوساوی بەنـــد کـــراوە
وشـــەی پێشـــمەرگەی داخـــدارم
وا لە دادگـــای بێـــدادی دا وەستێنـــــراوە
پیتـــی بێـــڵ و بیـــوری شـــانی هــــەژارم
لـــــەمەیدانی بێـــــکارییدا
لـە ژێـر قەڵا
دێرینەکـــەی دەردەســـــەری و برسێـــتییدا
بـەلێـواری تەلاری بەخـوێن ڕەنـگ کـراوا، هەڵـواسراوە!
خوشـــــکەکانم، براکـــــانم
دەزانـــــن بـــــۆ قـرقـرتـــــۆکی ڕازەکـانــــم
بـــــەگاز و چرنـــۆکی تـــاوان دەردەهێنـــن؟
ناهێلـــن هـاوارەکانـــم لە ســـەر شـــانۆی دەزگیرانـــم
بگـــاتە گـــوێی هاوڕێکانــــم؟
تـــومەز ئەوان دەزانـــن تیشـــکی خـــۆر دێـــنم
بـــۆ تـــاریکە شـــەوی ڕێگـــای نیشتمانـــم
بـــۆ نیگـــای چـــاوی بـــۆرژاوی بینەرانــــم

گوێگرەکانم ...

دە بفەرمـــوون بـــۆ وەڵامـــی

پرســـیاری کـــوا چ قەومـــاوەی گەورەکـــانم؟

بـــۆ وەڵامـــی، کـــوانێ ؟ کـــوانێ؟

چ ڕوویـــــداوەی بـــــرادەرە ســـــادەکانم!؟

گـــوێ لە هـــاواری ئەکـــتەری

نـــاو چڵپـــاوی، پەژارەکانتـــان ڕابگـــرن

گـوێ لە نـاڵەی شـیعری برسـی و دەردی دڵـی

گـڕی بە تیـــنی ئەویـنـــی دڵـدارەکانـتـــان ڕابـگـــرن

جـــا دەبینـــن چ قەومـــاوە ؟

خەڵکـــی هەناســـەی ســـواربووە

بـــێ یـــار و بـــێ دڵـــدار بـــووە

سەیرکەن وا :

بەگـزادەکان

سواری ماینی کەحێڵ بووینە! زاک وماک لێک هاوێر دەکەن!

وردیلـەکـان فێـری زوڕنـا و هەڵپەڕیـن و بلوێـر دەکـەن!

باری قرشەی . شەغرەی گەنمی جوتیارەکان

لـە سـەر پشتی کەرە بـۆز دادەکـەلێـنـن!

بـەردەوام هـەر

شەقڵی ڕق و مۆری چەوساندنەوە بـەسەر

ڕەوسەکانـــدا دەوەشێنـــن !

دەی پـــێم بڵـــێن، چ قەومـــاوە؟

سەیرکەن وا ...

خـــاتوو زینـــی خۆشەویســـتی

بە ڕێنـوێنی، کـۆلکەی سـاختەی مەرگەوەڕی داسـتانەکان

دەدرێـــتە بەر نـــووکی تیـــژی

خەنجەری مێشـکی وەسـتاوی! پەڕی زەردی ئەفسـانەکان

ئـاوی چـاوی کـاکە مەمە جـگەر سـووتاو و تۆراوەکـان

خـــوێنی دڵـــی عاشـــقە بـــێ پشـــتیوان و ڕاونراوەکـــان!

دەکـــرێتە دەرمـــانی ژانـــی

کەڵـــبەی ڕزیـــوی "شـــەوە"کان !

پـــێمان بڵـــێ چ ڕوویـــداوە؟

بـــۆ چـــی وا عـــادز و تـــووڕەی؟

هۆشـــت لەســـەر خـــۆت نەمـــاوە؟

+ دەی سەیرکەن!

هێشتا ڕستە مۆری دەستی "بەرخۆکە"کان

لە گەڵ قـرمەی، ڕێـژنەی گـوللەی

چەکدارە ترسنـۆکەکان، دەسـت لەملانێـن!

هێشـتا "بەردی گەورەو گچـکە"ی

پەندە بۆگەنیوە کانمـان! بەناوی خوا پاڵمان دەنێـن!

دەرەبـــەگـــــە لـەرزۆکەکـــان!

کـــێڵگەی خێـــرو بەرەکەتمـــان دادەچێنـــێ

کە گەردەلـــوول و گێـــژاو هێـــرش دەهێنـــێ

هانا بۆ بەر عەلی مێوانە مێوانەی

عەقڵی کۆنەی، مێژووی پڕ فیشاڵمان دێنێ

پەنـــا بـــۆ بەر خەونـــی پـــووچ و هەڵ بزوڕکاومـــان دەهێتنـــێ!

وتەی عەجایب! لە مێشـکی، وشـک و بەنجکراومـان دەردێنـێ!

چ قەوماوە؟

+ دەی ســـەیرکەن : ڕەشەبـایـــە

تۆفـانــە لافــاو لــە خـوێنی ســاوای نـاو لانـک هـەستــاوە!

چـاو ئاسـمانی شـین نـابینێ !گـوێ پەردەی خـۆی دەدڕێنـێ!

فەرتەنەیە و کەس لەهەقـــــی کەس ناپرســــێ

وەیشـــوومەیە و زینـــدوو لەمـــردوو دەترســـێ!

بـێلن بـا دوژمـن تێـپەڕێ! سـەگ بە خـاوەن خـۆی بـوەڕێ!

لوولەی بڕنۆکانتان شـۆڕکەن! فسـکە فسـک و قسـەی قـۆڕکەن!

شەرم مەکەن!

+ بهـــێلن حەســـەن و مـــریەم

بەدەســـتی جانـــداری ســـوڵتان

مریـد و چڵکـاو خـــۆری ئاغـــان ســـەرببڕدرێن!

بە نـا هەقـی و بەخـوێن ســاردی

بەوعەشـــقە پاکەیانـــەوە لەنـــاو بدرێـــن!

+ بێلـــن شیرینـەکـەی فەرهـاد پیـرێــژن یـاری پـێ بـکات !

بێلن کۆمـارەکەی قـازی لە مەهـــاباد

ڕەزا شـــا تیـــر بـــارانی کـــات!

زووکەن" زولفەقار"ی ئیمام! بـۆ حەزرەتی گورگ، بێـنـن!

تـا ملـی ڕۆڵـەی ئەم گەلەی پـێ پەل بـدات!
دەی کـڵاوی خۆتـان بگـرن تـا بـا نەیبـات!

+حەی یـاهوو حەی ! دەروێشـەکان زەرگ بێـنن!
دەم و قەپۆزتـان سـندم کەن بـاش خـوو بگـرن !

هەتـا کەف و لیکـاوی لالغاوەتـان
بـنکە و هەواری کافرەکـان ڕادەمـاڵێ !
تـا ورشـەی شـیر و نەعـرەتەی ئەوحاڵەتـان
شـەیتانەکان لەو هەرێـمانە نـاهێڵێ!
چ قەوماوە؟
+ سەیرکەن وا ؛
بۆیاخچییەکان ...
بـووکی زێـڕی ڕەش و گەنمـی قەنـدەهاری
لە بەرچـاوی کـوردەواری
بـێ مـارەبڕین دەگـۆزنەوە!
قاچاخییەکان، وا لێـرەوە یـا لەوپەڕی سنوورەوە!
چـوکلێتـەکان، لە ئاسـماندا دەقـۆزنەوە!
خۆشـحاڵی خۆیـان دەنـوێنن
وەک سوێسـکە هەڵـدەبەزنەوە !
بەربووکەکان
دەسـت بەخەنە و لالێـو بە زەردەخەنەوە!

بـێ چـاو و ڕوو، دەقیـژێنن، هـاتووین بـۆ بردنـی بـووکێ!
دایـک و خوشـک و کەس وکـاری شـاری بێنـازی کەرکـووکێ!
قـەڵات و بـابـە گوڕگـوڕی نـابێ بـکەن نـووکـە نـووکێ !
لە چاوی حەسوود بەدوور بێ! بـووکمان گەلـێ جـوانە بـووکێ!

★ ★ ★

ڕێبوارەکان ....

هۆ دڵدارە بێدارەکان

گەرچی ئەمڕۆ

نیشـتمانی پـڕ کەلاوە و ئـازار و ژان، پرسـەبارە
خەڵکـیش چـاو پـڕ لە گریـان و پەشـۆکاو و بـێ قەرارە
قەینـاغ و داس و هەسـانی شـەهیدەکان
دەسـت و پەنـجەی بـووکی مەبەسـتیان پـێ دەوێ
خەنـاوکەو گـوارەو خەزێمـی، جـوانەمەرگە چاوکاڵەکـان
دڵـی پـڕ ئەویـن وگەرمـی زاوای خۆیانیـان پـێ دەوێ
کەچی هێشتان....
هێشـتان دڵـدارە ئازاکـان
لەمەیـدانی بەرگریـدان
وازیـان لە عەشـقی پیـرۆزی ئەم خاکەیـان نەهێنـاوە
هێشـتا گڵـپەی بیـری گەشـی چەوسـاوە دانەمرکـاوە
هێشـتا پێشـمەرگە وریاکـان
سـەنگەرە خوێناوییەکـانی حوزەیرانیـان بەرنەداوە
پـاڵە و سـەپانە برسـییەکان

وازیـــان لە زامـــی پـــڕ لەســـوێی، گڵێنەکانیـــان نەهێنـــاوە
دڵدارەکان
دەســـتیان لە گەردەنـــی چیاکـــان
بـــاڵای ژینـــی سەرفـــرازی، بەرنـــەداوە

تـا تێر شـیری مەمکـی دایکـی کـوردەواری هەمـووان نەبـین
تـا تـێـر بـەفراوی کـانیـاوی ئـازادی کوردسـتـان نەبـین
بـڕی تینـوێـتـیمـان نـاشکێ و
هەنگاوێـکمـان سـەد هەنگـاوە
سەریـشمـان لەو ڕێـیە بـڕوا هەرگیـز نـاگەڕێـینـە دوواوە!

هەولێر حوزەیران ١٩٧٣

رستەمۆری: تەزبێح
بەرخۆکە: شێتێکی هەولێربوو

## جەژنەی ئەمساڵ

ئای لەم جەژنەی ئەمساڵم چەندە بێ تۆ بووم
جەژنی چی؟ قوربان! زەقنەبووت بوو لە لای من
خۆشبەختی ئەو کاتانە دێتن بەرە و ڕووم
خۆم خزمەتچیت بم و تۆش بێی ببیە شای من

★لەساڵی ١٩٧٥ نووسیومە، ٢٠١٥ دەسکاریم کردووە

## نامەیەك لە کەرکوکەوە

کیژۆڵەکەی سۆز و عەشقی تاقگەی گڕی خۆشەویستیم
ئەی بەرهەمی هیوای گەشی قیبلەی جوانی تۆ پەرستیم
ئەی ئاوازی عودو سازی هۆنراوەی پەرگەندەی ئێرەم
گەشاوەترین گوڵە باخی ناو هەولێرە دڵگیرەکەم
وام لە شارێ
کەرکوکی بێ بەش لەخۆشی و زەماوەندی نەو بەهارێ!
وام لە ناو دڵی خوێنینی سارێژ نەبووی گشت دڵدارێ
لە شوێنێکام
لە سەرچاوگەی مێژووی کۆنە برینێکام
لە کەرکوکام
لە کەرکوکی زاوا مردووی تازە بووکام!

لە کونجێکیا بەغەمگینی هەڵتووترکام[*]
چەندین پرسیارم لەخۆم کرد بۆ هیچ کامیان، نەمبوو وەڵام!
چیم بۆ نەکرا تەنیا بۆ باوەشی گەرمی ئێوە سووتام
تا لە توانام دابوو بۆ تۆو بۆ خۆم و بۆ کەرکوک گریام!
کەرکوک ١٩٧٢/٣/٢٨

## هەن لەگوێی گادا خەوتوون!

خۆشەویستم
پەری ئاوازی هەڵبەستم
خەڵکانێکی کرچ وکاڵ هەن
دواکەوتووی مێشک بەتاڵ هەن
وا ئەزانن وەک خۆیانین ئاشنای تاریکایی شەوین
ئێمەش هەڵپەی ئەوەمانە ڕابوێرین و لێی پاڵ کەوین
چیدیکە بە دوای گزنگی خۆری ئازادی ناکەوین
بەڵام گیانە ..
کوانێ ئەو مێشک سڕانە بیریان لە لای نیشتمانە؟
ئەوان لەگوێی گاداخەوتوون تێکوشینیان!بۆگیرفانە
وایانزانی
شوورەی پەیرەو و بڕوامان نزم ئەڕوانی

---

[*] هەڵتووترکان؛ دانیشتن لەسەر چینچکان.

وەکو ئەوان

تیری ئێمەش نادا لە نیشانە کە دەرچێ لەکەوان

کت و مت کۆپی خۆیانین

گەل و خاکمان بەلا ناوە خەریکی بەزمی شەوانین

بەڵام گیانە ، سوێندبێ بەم وڵاتە جوانە، ئێمە وانین

ئێمە عەشقی نیشتمانین هەر لەڕێی کاروان و ژوانین

☆ ☆ ☆

خـۆشەویســـتـم لەگەڵتـامـە ئـەی بنیاتـنـەری هـیـواکەم

بەتەمامە گەشتێکی خۆش ئەنجام دەم لەڕێی ئەم خاکەم

جابۆ هەستی پاکی و نەستی خەڵک وخاکمان، کڕنۆش ئەبەین

چـەکی بیری مرۆڤدۆستی لـەشان ئـەکەیـن، وچان نـــادەین

ئەڕۆین بۆ ناو گوند و شاری

دەشت و چیا و بن ڕەشماری

شوێن پەنجەمان نیشان ئەکەین

تـــا بـــــەکامی دڵمان ئەگەین

بـــــەلاسکی ناسک و پەڕەی گوڵ

بـــــــەنەغمەی چۆلەکەو بولبول

هـەوارێکی تازەو عـەشقێکی سەر لەنوو بنیات ئەنێـیـن

کوردەوارییەکی پێشکەوتوو ناوی بەهەشتی لێ ئەنێین

بۆ خۆم، بۆ تۆ، بۆ چەوســاوە و

بۆ دڵدارە چــــاو لەڕێـگا و ڕێبـــــوارەکان

بەیەکـەوە ڕاوی بیـــری سڕ و ڕزی و نـەزۆک ئەنێـیـن

شاخی زۆرسەختی ژەنگ گرتوو لەبن وبۆتکەوە، دەردێنین

نەک بەقسە بەکردار نوێن
کەللەی بۆشی پڕ کراو لەفوو  منداڵ دێن پێی ئەکەن تۆپێن!

گیانـــە  ئێمە مانـدوو  نابیـن  خاوەنی  بیـر و باوەڕیـن
ئێمە بێڵ و قازمە و خاکەناس بەدەستین
کوتکی کاوەین: دوژمنانمان باش ئەناسین
زۆر بەهەستین،
ئێمەی کرێکار، ئێمەی جوتیار
وەک شێر لەمەیدان دەوەستین
ناشترسین لە داڵ و کەمتیار! ڕەوە گورگی پاشای زۆردار!
کەڵبەی دوژمنان ئەشکێنین  قەڵای بێکاری ئەڕمێنین
کۆڵ نادەین و ماندوو نابین  دەستبەرداری  وڵات نابین
چ لە ئاشتی و ڕاوێژبین یان  لـەنـاو کۆڕی خەبات دابین

گوندی پیرئۆمەر    تشرینی یەکەمی ١٩٧٣

# ئۆ باڵی دڵ

خۆشم دەوێی یاری شیرین لەچاوما نەخشای تا مردن!
لە گیانەڵام سەرێک بـــدە ئۆباڵی دڵمت بـە گەردن!
قـەت هـەواڵـێکـم نـاپـرسی؟
بەجێت هێشتووم بە کەساسی!
گیـانە هـیچم لە تـۆ نـاوێ تەنهـا بەیەک نیگـای چـاوێ
هەناسـەکەم بـۆ بێـنـەوە تیشکـێـکی چاوەکـەت بـاوێ!
دڵەکەم بـۆ ببـووژێنـەوە بــە یەک ئیـشـارە و سـڵاوێ
خـوا دەزانـێ چەنـد پەشـێوم ڕوو لە نەهـات و نشـێوم
توخـوا جـارێ سـەرم لێـدە و بێـرە ڕەت بەو وەرەوە لام
ئەی دڵـبەرە دڵگیـرەکەم دڵـڕەقییەکەت دەرچـوو لە تـام
بە ڕووخۆشی بڵـێ چۆنی تـا غـەم یەخەی گیـانم بەردات
دۆستانم بێن بـۆ چـاو ڕۆنـی دڵـم لـەو دۆزەخـە دەرکـات
ئەو بەدکارە!جێ بێلە و لای ئارامت خۆشبەختی بەخـوای!
بێ تۆیی سەختەچاوەکەم دڵـم دەڵـێ تـۆش وەک مـن وای!

هەولێر ۳۰ /۷/۱۹۷۵

## بۆ سێ پاڵەوانەکە

**بۆ مامۆستا جەعفەر**

کاکە جەعفەر ...

مامۆستای داناو پڕ هونەر

هاوڕێی ئازیزم کەتۆیان هەڵدەواسی

وایانزانی

ڕێگەکەت کوێر دەبتەوەو نامینێ باسی

وایانـــدەزانی ئێمەشـــیان لە گەڵ تـــۆدا هەڵواسیـــوە

جەرگی گشت شۆڕشگێڕەکانییان بـڕیـوە

پــتر لەوەی کە دڕنـــدەن کوێـــر و نـەفـامـــن نازانـــن

هـــاوڕێ نەبەردەکانتـــان ڕژد تـــرن لەجەرگەی مەیـــدانن

ئێوە ئێمەن، ئـێمەش هەڵگری ئـاڵای ڕێـگەکەی ئێـوەین

درێژە پێـدەری شۆڕشـی میللەتـی کـوردی چەوسـاوەین

ئـێمە ئێـوەی چـاونەترس و بـــاوەڕدار و جەنگاوەریـــن

بازی بێریان چەندە دووربێ، ئـێمەهەر بۆتـان دەهێنـین!



کاکە هاوڕێم

یادت دەکەم و ناشگریێم

چونکە تۆ دژی گریان و نووزانەوەی

چونکە تۆ هاوڕێی برین و هەڵسانەوەی

هـاوڕێی ئەوانەی کە درێـژە، بەو ڕێیــە پیــرۆزەت دەدەن

نـاوی تـۆ لەدڵ وگیانیـان، بەخـوێنی گەش نەخـش دەکەن

هـاوڕێی ئەوانەی کەهەردەم، خەمـی ئەم مـیللەتە دەخـۆن

هەنگاودەنێن، شوێن پێی تۆ بەرنـادەن بە ڕێـی تـۆدا دەڕۆن



کـاوە زوحاکـێـکی فەوتان   بـوو بـە ڕەمزی سـەرفـرازی

هەتـا ئـەم میللەتـە مـابێ   نـاوی دەمیـنێ لـە بــەرزی

کـەچی ئـێوە  نـەمردوونــە  لەدڵـمانــن  بـە پـێـوەنــە

سەری چەندیـن ئـەژدیهای نـەقـۆڵای واتــان پــەڕاندووە!

ئاڵای چەوساوانتان لەسەر چیای هەڵگورد داچەقانـدووە!

ئێوە کـاوەی ڕاسـتەقینەی  شۆڕشـی ئەمجـارەی ئـێمــەن

ئێـوە گـڕی داگیرسـاوی  هەڵسـانی ئەمجـارەی ئـێمــەن

ئێوه هەزاران بزمارتـــان

له دارەبـــازەی زۆرداران داکوتـــــــاوه

سەدان خەنجەری دەبان و جەوهەردارتان

لـەبـڕبـڕەی پشتـیـان داوه

نـــاوکی کۆرپـەڵەی ئـازادیتـان بڕیـوه

ئێـــوه ئـــاڵای خوێناویتـــان له دڵتانـــا هـەڵـواسیــــوه

ئێـــوه گشـــت خوێمژەکانـــان لەگیانتانـــا هەڵواســـیوه!

هەولێر ئەیلول ١٩٧٦

مامۆستا جەعفەر عبدالواحیدو ئەنوەر زۆراب و شەهاب شێخ نوری لەپـایزی ســاڵی ١٩٧٦ بەدەستی ڕژێمی بەعس لەسێدارە دران..

# دڵدارەکەم بناسن

دڵدارەکان ....

هـۆ عاشقـە بـێـدارەکـان

ئەوساڵانەی هەرزەکاربووم

لەکــۆڕی ئەویندارێدا لێـو بـەبـاربووم

چەند کیژۆڵەی قشتیلەو جوانکیلە هاتن

خـۆشم ویـستـن

خۆشیان ویستووم

بەڵام هیچیان، وەک ئەویارەی، ئێستا هەمە

دەرسی ئەڤینیان بەشەوق، فـێـر نەکردووم

هیچ کامیان وەک ئەو دولبەرەی لە دونیادا وێنەی کەمە

ئـاوا دڵ و هۆش و بیریان بەیەکجاری لێ نەسەندووم!

ئەو فێـری سۆزی هۆنراوی پڕ لە چێـژی عەشـقی کــردووم

ئاشنای زامی سارێژ نەبووی پرسفت و سۆی کوردی کـردووم

فێری کردووم

لەوســاتانەی لەســەرخاکی داگیرکراوما، مەرگ دەبـــارێ!

ئەو شــەوانەی کـۆرپە لە بەر مەمکــی دایکــی هەڵـدەگیرێ

بەگــژ مــردن دا بـێمەوە و دەســتی بەخــوێن ســووری ببــڕم!

بەگــژ زۆردار و خوێنخۆرانــدا بــێمەوە و جەرگیــان بـبــڕم!

## دڵدارەکان

دەتــــانەوێ  دڵدارەکـــەی خـــۆم بە ئێـــوە  بناســـێنم

بە زمـــانێکی ســـاکارو جـــوان  جگەرگۆشـــەم بلاوێـــنم

دڵدارەکان،  دڵدارەکەم

کیژۆڵەیەکی کۆچەری

هەژارێکی دەربەدەری

ئەم  کوردستانـە ئازیـزەی

ئەم خاکە پەست و دڵزیزەی

منی مەست و ئێوەی شەیداو خۆشەویستە

هی گەلـێکی سەرگـەردانـە وا ژێر دەسـتـە

دڵبەرە سەوداسەرەکـەم

هەرچی برین و ژان هەیە، ئەو دەناسێ

خۆشەویستی مرۆڤایەتی و جوانییە

لەدانیشگای زانست و پاکی دەرچووە

کانیاوەکەی  دادپەری و یەکسانیـیـە

دەرسی خۆڕاگری و هەستی  کۆڵنەدانی تیا خوێندووە

ئەوەی بـڕوای لەپـۆلابـێ

بە دەهـــۆڵ و پیـــک و زوڕنـــای عـوڕوبـــە ڕانـەتـەورابـــێ

بەوەهمـــی کۆنـەسیپـــاران   لـــە مـــرۆڤ کوشـــتن نەگلابـــێ

ئەوەی گیـــانی  بە تیشـــکی خـــۆری ئـــازادی  ئـاودرابـــێ

ئـەو دەناسێ

هـیچ پێناسـەکی بـێ نـاوێ ئاسـان دەکەوتە بەرداسـێ!

خێرا دەکەوتە ناوباسێ!

***

دڵدارەکان دڵدارەکەم

پەریـزادە نازدارەکەم

خەنجەرێکـی جەوهەردار و بـێ کێڵانـی پێشـکەش کـردووم

لەو فێرگـە یەکسان خوازەدا پەروەردەبووم

تێی گەیانـدووم

کەخوێنمژێ، دزێ، حیزێ!

دەرگـای کلـۆڵێ زامـدارێ عاشـقێ دژە بەدکـارێ

بە نـارەوا ڕاهـەژێنـێ، ئارامییـان بشوێنـێ

بـێ فەرمـانی هێـزی چـاکە یـان هـی شـەیتان!

بـێ سـێوو دوو، بە بـێ هـیچ هەڵوەسـتە و دامـان

قـوڕگی بگـرم، بـۆی بـێمە نـاو جەرگەی مەیـدان

کـوردانە ڕاپبوەشـێنم مەردانە تێـی بـسرەوێنم

هەولێر ٣/٧/١٩٧٧

## پەلەهەورێکی بارگران*

پەلەهەورێکـــی ســـەنگین وا لەم ئاســـمانی کوردســـتانە
دەیەوێ دابـــاریتە ســـەر ئەم کـــێڵگە تێنـــووە وشـــکانە
جوتیارەکـــان چـــاوەڕێنە بۆیـــان پاراوکـــات دەغڵـــودان
ببـــووژێننەوە کانیەکـــان، ڕەزو بـــاخ و جـــۆگەو بێســـتان
وا وەرزێـــرە هەژارەکـــان چاویـــان بڕیـوەتـــە ئاســـمان
پـالّە و سـەپان شـوان و گـاوان بەتەمـای ئەو پەلە هەورەن
زەوی تیراوکـــات بە بـــاران ئاســـوودەکات دڵـــی هەمـــووان

پەلـە هـەورە بـارگرانـەکـــە
هۆ ئاودێری سروشتی خوایی
دابـبـارە و نـــۆژەنـــکەوە و تێـــراوکـەوە لێـــوی زەویی
بـێـنـەوە شـــایی ئینسان و حەیوان و باڵنـــدەی کێـــوی
زووکە ســـەردانێکمان بـــکە بەهانـــای برســـییەکان بـــگە
قەدەرێـکـــە چاوەڕوانـیـــن بماندەیـتـــێ دڵنیـایـــی
مەمـــانخەرە دڵەڕاوکـــێ و ڕۆخـــی تینـــوێتی و وشـــکایی
تەبـــارە و مـــاڵاتی هەمـــووان، بەتەمـــای تـــۆن هەوری بـــاران
شـــەکەت و تینـــوون، چـــاوەڕێن، خێـــرا چـــارەیکە دەردی گـــران

## هەوری باڵدار

به شـــەوقتر له نیگـــای چـــاو، تەڕتـــر له خـــوڕەی تـــاڤگەی ئـــاو

ببـــارە بـــۆ هەناسەسوار

خـــاک و خەڵـــک و زینـــدەوەر گشـــت، کەوتـــوونەتە حەلا و وەلا

دای بـــارێنه به نـــاوی خـــوا بیکـــه هەورە تریشقـــه و هەرا

پـــــەلە هەورە بارگرانەکە

ئـــارامبەخشه نەخشینەکە

که داباریـــت بیـــرت نەچـــێ لەپێویســـتیمان دەرنەچـــێ

دڵۆپەکانـــت ئاگایـــان له لاســـکی ناســـکۆڵه و چـــرۆ بـــێ!

کوڵیک و حاجیله و هێرۆبێ

زووکـــه بگـــه به هـــانـــایـــان

بەڵام ئامان! بـــاو بـــارانت لـــه سەرخۆ بێ!

ئـــاگـــات لـــه مەڕومـــالاتـــی بـــێ ئـــالیک و کـــاو و جـــۆبـــێ

تەرزەکانـــت به تـــووڕەیی، نـــەدەن بـــه ســـەر مـــاڵی نـــەدار

نەرمه نەرمه، بەهێواشـــی، بـــا ئەو نـــیعمەتەت بێتەخـــوار

بۆ ئێمەی بێ سەبر و قـــەرار

نـــەبێتـــه لافاوی لاســـار!

هـەوری نـازدار

بـاران و بـای تـووڕەی زستان یاخود بەهـار

بە ئەسپایی پـاراوکە سروشت و زەوی و زار

پڕشـنگی خـۆر کە پەڵـکە زێڕینـــەی ڕەنگـین، دەنەخشـێنێ

بە بـــارین و دڵـــۆپی زۆر، بەهەشـــتی جـــوانی دەنـــوێنێ

بەهارێـــکی ئەفسوناویـــش , بێـنـــە بـــۆ ئەم نیشتمـانـــە

با ژینێکیِ خۆش سـاز بـێ بـۆ، هەرچـی بەسـیفەت ئینسـانە!

هەولێر ٢٠٢٢/٨/٢١

✯ ئەم شیعرەم (پەلەهەورێکـی بـارگران) بە یـادی شـیعرێک نووسـیوە، بەناونیشـانی (پەلە هەورێکی ماندوو) کەلەساڵی ١٩٧٢، لەمیهرەجانی شیعری، کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی، لەهۆڵی گەل خوێندمەوەوە، لەگەڵ چەندین شیعری ترم فەوتاوە. بە هیوای ئەوەی ئەم پەلە هەورە جێی پڕبکاتەوە.

## نامەیەك بۆ دەزگیرانەكەم

دەزگیرانی خۆشەویستم

نزیکترین هاودەمی هەستم

کانگەی بەرامەو هەناسەی ئەوین و سۆزی هەڵبەستم

گەر دەتەوێ بە ڕاشکاوی و بێدەربەستی! بتپەرستم

وەک دەتەوێ دەروێشی جوانی باڵات بم

ڕۆژو شەوێ قوربانی میهرو وەفـات بم

بەفیدای دەردو بـەڵات بم !

هەمیشـە هاودەمی من بـە، قەت و قەت پشتم تێ مـەکـە

بەدوای عەشقی گڕگرتووما شاخ بەشاخ، دەشت و دەرتەیکە

لە گەڵ ویژدانی زینـدوومـا کاروانی ڕەنجدەران سەرخـە!

ڕێی چینی کارگەری بـگرە و وەفـاداری خۆت بە دەرخـە!

گیانە گیانە گەر دەتەوێ بە بێ سنوور خۆشتم بوێ

لە گەڵمابە لەو مەیدانە، تا چەوساوەی گەل سەرکەوێ

گـەر دەتەوێ وەک دەتـەوێ

مەرگم بە پێش مەرگت کەوێ

عەشقت لە دڵما چەسپا بێ، قەت تۆم لەبەرچاونەکەوێ

تەنها و تەنها هەر تۆی تیا بێ، ئاڵای دڵداریت نەنەوێ

لە گەڵمابە، تا بەشخورای خاکمان مافی خۆی دەستکەوێ

گەر دەتەوێ دڵم لە ناو گڕی ئەو عەشقەت فەنا بێ

پەیمانی گیانی گیانی بێ، دەست لەسەرسینگ بۆت وەستابێ!

لە ژوانێکی کوانووی خەبات، دڵم ئاگر بباریێنێ

لە تۆ زیاتر کەس نەبینێ! شیعرم هۆشت بشێوێنێ

وەک دێوانە بتکەم بەشەم خۆشەویستیم داتگیرسێنێ

هەتا مابین کەس پێی نەکرێ لە یەکترمان بڕەنجێنێ

وەرە لەشەوی تاریکی زستانی ساردی بێ ئامان

ڕەگی زۆرداری دەربێنین

لەقرچەی گەرمای هاوینی، دەشت وچیای پڕهات ونەهات

داگیرکەری خاکی وڵات بە یەکەوە دەرپەڕێنین

ئازیزەکەی دڵم گیانە

با چاوی کیژی بێنازی چەوساوەی ئەم نیشتمانە

بەکلچووکی خۆشەویستی دابڕێژین

ئاسوودەیی لە دڵی گەل دابڕێژین!

ڕقێکی نەرم و جوان، پیرۆز!

بۆ مافی گەل بنەخشێنین

مەشخەڵی سەرفرازی نەورۆز

بەرەو دەم کەل، هەڵگیرسێنین!

واتـــای هەستـــان دژی بێگانـە پـەرستی

ڕابوون دژی عەقڵی قوندەی کۆنەویستی

تۆوی وەستان، دژی ئاغا و شێخ و شەیتان! دابچێنینـن

مافی گەلمان بکەینـە وێـردی سەر زمـان، دانەمێنیـن

ژنیش شان بەشانی پیـاوان، بێـنـیـنـە کۆڕی تێکۆشان

تا یەکسانی بەرهەم بێ بۆ کۆی ژینی نێرومێی ئینسان

دەنـا نـە تۆ ئازاد دەبی و نـەچەوساوە و نەکوردستان!

هەولێر ١٥/ئاداری/١٩٧٩

# شەش نامەی خوێناوی بۆ شەهید جەمیل ڕەنجبەر

"لە چڵلەی شەهید نووسراوە"

## نامەی یەکەم

**مانەوە بێ ڕەنجبەر:**

هاوڕێکاکەم

کاکە ڕەنجبەری براگەورەم

کە هەواڵی شەهید بوونی تۆیان پێدام

هەند شپرزەو ناڕەحەتبووم کاس بووم تاسام

نوقمی پەژارەو خەفەتبووم یەکجار شێوام

چەندی بیرم لەم هەواڵە دەکردەوە

بۆم نە دەکرا بەم ڕووداوە جەرگبڕە بڕوا بکەم

چۆن بڕواکەم کتوپڕی کاکی لاوم لەدەست بدەم؟

تا ئەندێشەش توانای نەبوو مەرگی تۆ بێنتە بەرچاوم

کێ دەتوانێ خەبەرێکی کەمەر شکێنی وای بدەنێ

وەک گۆچان کووڕ نەبێتەوە و پشتی نەشکێ؟

کێ بۆی دەکرێ؟

ڕەنجبەرێکی خۆ نەویستی جێی بهێڵێ، ڕانەچەنێ؟

خۆی ڕابگرێ و لەڕیشەوە هەڵنەقەنێ؟

هاوڕێم هەرگیز نەمدەزانی

وا بە زوویی لە شەقەقەی باڵ دەدەی، دەفڕی

پلەی بەرزی شەهیدبوون بەباڵات دەبڕی

ئێمەو ئەو هاوڕێیانەشی خۆشت ویستن

ئەو هاوژینە دڵ کون کونەی

ئەو کیژۆڵە پەپوولانەی سەرفرازیت بۆ دەویستن

بە نـاکاوی بـەجێ دێڵی بەسەرگەردانی وبەوێڵی

کاک ڕەنجبەری پێشمەرگەی کوردی دڵسۆز، شۆڕشگێـڕم

ئە ی پێشڕەوە نەبەردەکەی ڕێگای سەختی پڕ هەڵدێرم!

کەهەواڵەکەڕاست دەرچوو هەرچی خۆشەویستی تۆ بوو

هەر کێ کوردی ئەسڵزادەو بەشەرەفبوو، دڵ پڕسۆ بوو!

لە ناخەوە بۆ تـۆ گریان

هاوڕێکانت سەری ڕێـزو نـەوازشیان بۆت دانەوان

دایە ئاسک جەرگی کونـاودەر بوو بڕا

بەدایەڕۆ و بە ڕۆڵە ڕۆ، دونیای تاسان!

ساڵح گۆران پشتی نووشتایەوەو شکا

لەپرسەکەت وەک مەنجەڵی چێشت دەکوڵا

ئەو هاوسەرەت کەدایکی کۆرپەکانت بوو

ئەو گوڵانـــەش

ئەو ئەستێرە گەشاوانـــەش

که بەقەدەر چاوەکانت لات ئازیز بوون
مات و دڵـزامدارو زیـزبـوون
هـەرەوەزو بـوێـر،  هەریـار
مانەوەبێ سەرپەرشتی باوکە ڕەنجبەر!



## ئای کەجوانبووی

هاوڕێگاکەم دوای چەند ڕۆژێ
هەموو بۆلات کەوتینە ڕێ
تا تەرمە خوێناویەکەی تۆ
لە بن چیای کێوە ڕەشەوە
لـە دێی پیـرانـە ڕەشـەوە
بەناوکۆیەی شەهید جەعفەری هاوڕێگات
بۆهـەولێـرەخەمبارەکەی ژێردەست ولات
بەسەر بڵندی ببەینەوە؛
"ئای کە جوان بووی
وای چەند بەرزو قارەمان بووی
کــە بـەو جــلکە پێـشمەرگانـە
لەناو گۆڕێکی ساکارو هەژارانە
بـە دڵنیـــایی خـەوتـبـووی!

دلێرانــە پاڵ کەوتبــووی

کە سمێڵە قەترانی یەکەی تــۆم بــەدی کرد

کاتێ سەرە کوێستانییەکەی تۆم بەدی کرد

کەدەتووت تازە چیای قەندیل

بــەفری بـــەدیاری هێنــــاوە

بۆسەری بەرزی کاک جەمیل"

جا بڕوام کرد، زانیم ڕەنجبەر

ئەو کاروانەی چۆل کردووە

مامۆستاکەم گیانبازی کردووە بۆ وڵات

منی تەنیا جێهێشتووە لەڕێی خەبات

ئەو بەچکە شێرە مەردەیە ئەوپێشمەرگە سەربەرزەیە

ئەو شاعیرە بە هەڵوێست و کۆڵنەودەر و جەربەزەیە

نانی دیلی ژینی دیلی نەویستووە

ئەو شۆڕشگێڕە مەزنەیە، لە پێناوی ڕەنجدەراندا

لەپێناوی ڕەش وڕووت و بێچاراندا

گیانی بەخاکی کوردستان سپاردووە

بۆیە ئاوا هاوڕێکانی تــە زانــدووە

## نامەی سێیەم

### برینی قووڵ

هـــاوڕێگاکـەم

ڕەنجبەرە دڵ پـڕ هیواکـــــەم

ئەو برینە قووڵەی کەوا لە جەستەی تۆی شەهید دابوو

چەند لەگەڵ توانـاو بـڵـنـدی

تۆی پێشمەرگەدا گونجابوو

ئاواتت بوو بە سەر بەرزی و کەڵە مێردی

بەدروشمی (کەم بژی مەردوکەڵ بژی)

وەک کاک یاسین بەڕووسووری

دەست لە ملانێی مەرگ ببی

مەبەستت بوو، لەڕێی شۆڕشی چەوساوە

گیانی پاکی خۆت ببەخشی

لەڕێی خاکی ئەم نەتەوە زۆرلێکراوە

خوێنی گەشی خۆت ببەخشی

هاوڕێ تۆ لە ناو دڵمانی

لە ناو خوێنی جگەرمانی

تۆ نەمردووی قەت ناشمری

تۆ گەورەی، گەورەییەکەشت

بەقەد گەورەیی وپیرۆزی ڕێگاکەتە

تۆبەرزیت و بەرزییەکەشت

بەقەد باڵای چیای هەڵگوردی وڵاتەکەتە

چ مرۆڤێکی شۆڕشگێر، هەیە ئەمڕۆ

خۆزگە نەخوازێ وێنەی تۆ

مێژوو ئەوها ناوەکەی وا بە شانازی

لە سەر ترۆپکی نەمری

لەسەردەفتەری چەوساوە و خاک پەروەری

بە ئاوی زێڕ تۆماربکرێ ؟

بە گوڵاوی نێرگزی کوێستان

لەسەر ئاڵاو لەسەر هەواو

لەسەر دار و بەرد و چیا بنەخشێنـرێ؟

تا کوردستان و کورد هەیە لەیاد نەکرێ

## نامەی چوارەم

## وامدەزانی قەت ناگرێم

هاوبیـرەکـەم

ڕەنجبەرە بەتەگبیرەکەم

وامدەزانی بەرامبەر گشت کارەساتێ

خۆم ڕادەگرم، قەت ناگرێـم

کەچی هاوڕێـم

کە خەبەری شەهید بوونی تۆی کۆڵنەدەریان بۆ هێنام

وەك دێوانە، گـڕم گرت بەتین داگیرسام، وا پـەشـــۆکام

گریان دەستی لێ سەندم و لە دە سە ڵاتم دا نـە مـا

چـاوەکانــم بـــوون بـــە کـانـــی و

جۆگەی خوێنیان بـۆت هەڵبەسـتا

پشـــــتم شـــــکاو چەمـــــامەوە

منی هاوڕێی گیانی گیانیت، بەتاقی تەنها مامەوە

جەمـــیلە مانـــدوو و مـــردووەکەم

هۆکـــاکە لە خـــۆ بـــوردووەکەم

هەندە بەکوڵ بۆت گریاوم  هەنا سەبـڕبـووم، تاساوم

وشـــەی تـــەڕ و پـــاراوم نـــازوڵاڵ بـــووە

ئەگینا بـۆ هەرچەندی دەکەم  بـۆم نـاکرێ؟

بە هۆنینێکی کوردانە هاوڕێگاکەی خۆم بدوێنم

ئەو هەستیارە خۆنەویستەی

هەرخۆشی ئـەو گەلـەی دەویسـت، بلاوێنـم

گوێی بێ دەنگی ئەم زەمانە

کش وما تە بـدڕێـنـم

دۆست و دوژمن سەرسام بکەم، بە شاکارێ بتا سێنم!

کێ  پێی دەکرێ؟

شـیعرێکی پـڕ حەسرەت و کارەسـاتباری وا دا ڕێـژێ ؟

زامی ڕەنجبەری پێشـمەرگەی بەرمەیـدانی تیـا بنێـژێ!

بۆن کرووزی جەرگی دایەی
ڕۆڵەی شەهیدی دووبار بێ
هاڵاوی هەناسەی بابەی
دڵ بریندار ی لێ هەڵسێ و بێ قەراربێ
دادو فیغانی هاوسەری، شەیدای ڕەنجبەری لێ باربێ!
خەمی هەر سێ کیژۆڵەکەی باوکەشەهیدی نازداربێ
چ هۆزانڤانێ شاعیرێ
شیعرێکی وای بۆ دەگوترێ؟
گەر دەتوانێ با بەدەنگبێ و بۆی بهۆنێ
بوێربێ وسەرکێشی بکا و جا بیخوێنێ!

## نامەی پێنجەم

## ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕ

مامۆستای ئەلف و بێ زووکە
قوتابییەکانت چاوەڕێنە
زەنگ لێی داوە و ئێستاکە کاتی فێربوونە
ڕەش وڕووت و بێچارەکان بەتەمای تۆنە هەنووکە
وەرە دەرسی پەروەردەیی و شۆڕشگێڕیمان فێر بکە
واتای شۆڕشی جوتیاریی و کرێکاریمان فێربکە
وەرە مانای نەبەزین و کۆڵنەدانمان تێبگەیەنە

وەرە نرخی خوێنی گەشی شەهیدانمـان تێبگەیەنە

بۆ چی دەڕۆی؟کێ قوتابی وا لە ناکاو جێ هێشتووە؟

کـێ کـــاروانی ڕەنجدەرانی یەکجار وا شڵەژاندووە؟

هێشتا زووە، نابێ بڕۆی!

ئەی خـۆت نەتگـوت ئەم مـیللەتە چەوسـاوەیە

پێویستی بە ڕۆشنبیری شۆڕشـگێڕو ئـازا هەیە؟

هاوڕێکانت چاوەڕێن بە، قسەو کرداری بێوێنەت

شیعر و گوتاری مەردانەت

ئەم شۆڕشە درێژخایەنـە

لـەم هـەوراز و نشێـوانـە

بگەینیە ترۆپکی ئازادی و بەسەر ئەو چیایانەی بخەی!

لەوەرزی میوەڕنین و دروێنەشدا

هەرەوەزیان لەگەڵ بکەی!

لە شینگێڕی و لێ قەومانی بێ وێنەشدا

دەسباریان لەگەڵ بگریت و قەت و قەت پشتیان بەرنەدەی

لە گۆڤەند و شایی و سەرکەوتنەکانیشدا

سەرچۆپیان بۆ بگریت و ڕێکیان بخەی!

**شەهید نامرێ**

هـاوڕێ گیانی گیانییەکـەم

خەمخۆرەکەی ڕەنجدەرانی وڵاتـەکـەم

ئـەی ڕەنجبـەرە بـوێـرەکـەی

ڕەمزی سەربەرزی و نەبەزیـن

ئـەی دڵـدارە هـەریـارەکـەی

کوردستانی نـوقـمی دەریای ژان و بریـن

هەڵۆی سەر لووتکەی بڵند و قەد شاخانـم

کارمامـزی دەشتی هەولـێـر و گـەرمییانـم

گەر شۆڕشێ قـوربانی وا گـەورەی هەبێ

بە بیـری شۆڕشگێـڕی تۆ جـۆش درابێ

چۆن بڵێسەی تێکڕای نیشتمان داناگرێ؟

دوژمـنـە فاشیستەکانیـش نـاتۆقـێنێ؟

گەر میللەتێ، ڕۆڵەی ئاوای پێشمەرگەبێ

پەیامبـەری وەک ڕەنجبـەری بـەڕێـوەبێ

چۆن لەژێردەست داگیرکەران ڕزگارنابێ؟

هاوڕێکانی جەمیل ڕەنجبەر

ڕێبوارانی ماندووی سەنگەر

ئەی پێشمەرگە ئازاکانی کوردستانی لەت لەت کراو

ڕۆڵە لە خۆبوردووە کانی کوردی بێلانە و ماف خوراو

شەهید هەر بە لاشە دەمرێ

شاعیری چەوساوان نـامرێ

رۆحی بێـگــەردی زیـنـدووە

لە شەققەی باڵ دەدا و دەفڕێ

نەمریش بە باڵای شاعیری گەل دەبڕێ

دەفڕێ و دەفڕێ

گیانی لە ناو گیانتان دایە

خوێنی لەناو مێشکی کراوە و دڵ و شادەمارتان دایە

ناوی لە گەڵ ڕاچڵەکیـن و دەنگ و پە لامارتـان دایە

هەتا وەکو پێشمەرگەیەکی بەباوەڕ بـــەپـێــوە بێ

رۆشنبیرێـکی شۆڕشگێـڕ تەکان بداو بەڕێـوەبێ

شەهـیـدانی ئـەم ڕێبـازە زویـر نابن

قەت خامۆش و دڵگـیـر نابـن

لـەیادی ئـەم گەلی کـوردەن

شەهیدی ئەم خاک و هەردەن

لـە فـیـکری وەچەی داهاتوو

دەنەخشێن و مات و مەلوول و کز نابن

دەچنە ناوتیشکی ئەستێرەو مانگی هێشتا هەڵنەهاتوو

قـەت بـزر و عــادز نـا بن

دەبنە ئەستێرەی گەلاوێژ

پێروو و تەرازوو بۆ ڕێگای سەربەرەولێژ

ڕێی کاکـێـشـان

لە بۆ کاروانی تێکـۆشـان

دەبنە هەتاوی سەرلەنـوو، بۆ سبەینێکەی کوردستان

دەبنە چراخان بۆ نـەوەی، لە گەڵ ئـازار ڕانـەهـاتوو

دەبنە مێژوویەکی زینـدوو   هێزێکی لەبڕان نەهاتوو

شۆڕشێکی دروستی بەئاکام گەیشتـوو

جگەرگۆشەی  دایکی بـەسـۆزی وڵاتن

تەکاندەر و پێشەنگی ڕێچکەی خەباتن

تا خەڵکی بە وەفا و عەشق و ئیمان هەبێ  قەت ون نابن

تـا بـەرگـری لـە دادگەری  ئینسان  هەبێ  کـەون نـابـن

چلەی شەهید ١٩٨٠/١٢/٢٨

جەمیل ڕەنجبەر لە ١٩٨٠/١١/١٨ شەهیدبووە

## من و مام هەباس

+ئەرێ ئەی کاکی ئەزموودار

تێرلەزەمەن! هۆ مام هەباس؟

جەربەزەی نێو مێژووی غەدار

تەژی ڕووداوی دەعەجان، کوشتن و گێچەڵ هەراوباس!

بۆمان بەیانکە پوختەیەک، هەواڵی تازە، دەنگوباس؟

+ هۆکوڕی خاس

پێمان ناڵێی کام دەنگو باس؟

بەناشکوری نەبێ فەرموو؛

ئەوەی هەمانبوو و نەمانبوو

خودانێکی بێدەنگ و کەڕ

دڕدۆنگ و لاپرەسەنگ و کاس

نا دیارێکی کون فەیەکون، خوڵقێنی گیاندار، جن و ناس

سەروەختێکی جەنجاڵی پڕ لە زۆرداری و نەهامەتی

کەس کەس نەناس؟

خۆویست تاسەر ئێسقان سازاو، لە گەڵ ترۆپکی کۆیلایەتی!

ناونراو بە کوردایەتییەکی ژەقنەبووتی

خاک نەناس عەشقی ئەلخەناس

کـلـکـه بـیـور و تـەورداس!

نوقمی ڕق و کینه و چڵپاو

کەس خۆ نەناس !

گەلێکی سەرلێشێواو و بێ فریاد ڕەس!

هیواییێکی بێ دایک و باو !

سەرێکی بێ کەللە، قوچاو!

ئاشێکی ئاو لێ بڕاو و

وڵاتێکی لەت لەت و دابەشکراو و

پڕ تەڵـەی لـەتـراز دانـدراو

کۆڵەکەی زڕ ! ڕانـەوەستاو !

+ئەی کاک میرزای تێر لە ئـەزموون، هۆ مام هەباس

ڕۆڵەی زەمـەنی بێ سنوور، پـڕ هەرا و باس

هی دەورانی چەرخی چەپگەردێکی نـاجوور

لەگشت ئیقلیمی خوارو ژوور، نێزیک و دوور

تو خوای ڕاستان

تو سەری ئەو ئازیزانەی لە ڕێی ئەشقا هیچ نەوەستان

چ بـاسـێـکی شــاراوەی وا هـەیــە لاتـان؟

بەسوود بێ بۆ میللەتی کوردی بەستەزمان

بە ئەسپایی بە گوێماندا بچرپێنـە

بە نهێنی بۆچەوساوەکانی بـێـنـە

تا ڕەنجدەرانی کوردستان

لێقەوماوی تێکڕای جیهان، بە ئاگا دێن!

لەم دەریا شێلوو و ئاڵۆزە قووڵە دەردێن!

+ئەمڕۆ ڕۆژی وردبوونەوە و لێکۆڵینە

ڕۆژی زانستی پەروەری و شەیدابوونە

شەیدای ڕزگاری چەوساوەی نیشتمانە

کاتی تەبایی و یەکبوونی، ڕیزی گشت مافخوراوانە

+هۆ کاکی خۆم، میرزا هەباس

ئەی جەربەزەی تەمەن بە قەد، تەمەنی ڕۆژ، کوا دەنگوباس؟

ئەو مرۆڤە دڵدارانەی

لە پێناوی گەلی خۆیان لەڕێگا بوون

ئەو دڵدارە بە جەرگانەی

ئەو گیان بازانەی بۆ خاکی خۆیان فەوتان گیان فیدا بوون

چییان لێدێ ؟ چیان لێهات؟

بوون بەپرسیاری بێ وەڵام؟

بوونە هەتوان؟ بۆ دەرد و غەمی هەژاران؟

یان پەژارەی ڕووت بۆ ژینی کەسوکاران؟

+ نا نا ئەوان بوون بە مێژوویەکی زیندوو

بوون به پێشەنگی گەلێکی لە خۆ بوردوو

بوونە بەستە، بوونە پەیام

بوونە مەرهەم بۆ سارێژی پەژارە و زام!

ئەوان گەیشتن بە ئەنجام

مەینەتی بۆ ئەوانەیە

هێشتاکە لەژیاندا ماون

لەڕێی ئەوان لایانداینە

دەستەمۆ و سەرگەردان بوونە

دەستەوەستان

لەخزمەت دوژمنـانـدایـە!

ملی کەچە بۆ ڕەشەبا و تۆفی زەمان

سەربەرزی جاویدانـیـش هەر

بـۆ ئەوانـەن؛ دەژیـن لە پێنـاو ئـازادی

یان بوون بە قوربانی خاک و گەیشتن بە مەرگی شادی!

ئەوانـەش کە دەژین لـە پێنـاو سەربـەرزی

گیـان فیدان لە ڕێی دادوەری و سەرفـرازی

نـەژیان ژینی بنـدەسـتی بە نامرادی و سەرکزی

+ هۆ مام هەباس

ئەی جەربەزەی تەمەن بە قەد تەمەنی خاک

هۆ خولقاوی خوداوەندی گـەردوونی چـاک

سروشتی پاک

کوا دەنگو باس ؟

لە چاوەڕوانیـدا، خێل بووین!

بۆ سەرکەوتنی ئینسانی چاکە خواز، ڕاس★

هەند تێڕامایین! هێڕ و گێل بووین!

+هۆ کوڕی خاس

هاوڕێی دڵدارانی چیاو

گوڵە حاجیلە و نێرگز و بەفر و ڕێواس

ئەی کەڵ ژیاو

ئەی دژە باوی قەتیس ماو!

کام دەنگ ؟ کام باس؟

بە ناشکوری نەبێ فەرموو

ئەوەی هەبوو، ئەوەی نەبوو؟

خودانێکی بێدەنگ و کاس

سەردەمێکی جەنجاڵ، تەژی ستەمکاری

مات و بێسەنگ

کەس کەس نەناس!

گەلێکی سەر لێشێواو و کەس خۆنەناس!

هیوایێکی بێ دایک و باو

ئاشێکی ئـــاو لێ بـڕاو و

زەمانێکی لە خۆبایی و تەڵەکەباز!

پڕ لە فاقی دانراو لەتراز

پڕ نیفاقی دەعوەتی قاز!

ڕووداوی پێش بینی نەکراو

چەرخێکی بێ نمەک، هەرگیز ڕانەوەستاو

مێژوویێکی پڕشوورەیی، بە درۆو فیشاڵ پف هەڵماو!

کوردێکی ئازا و دڵسافی، وەتی هەیە هەڵ خەڵەتاو

دوارۆژێکی گەش و ڕوونیش

دەربازبوونیش

دەخوازم بۆ میللەتێکی خاک داگیرکراو

سەراسیمە و بێ فریادڕەس، تەفرەدراو!

هەولێر ١٩٨٤/٩/٢٠

کۆڵەکە: ئەستوندەك

ڕاس: ڕاست

دەعەجان: زۆر ناشیرین

# سەرماو گڕی داستانێکی تر

"لە میهرەجانی شیعری زانکۆی سەڵاحەدین

لەهۆڵی ڕۆشنبیری هەولێر ١٩٨٥/٣/٦ خوێندم ."

ئەی بەفرەکەی ئەم زستانەی

شاری شەیدای زەردەخەنە

نەوبووکەکەی دڵ زامدار و دەست بەخەنە

ئەی زستانی بێئـامـانی

مەڵبەندی خەم وپـەژارە

جێنزگەی هەرچی ستەمدیدە و هەژارە

بۆچی لێمان بووی بەمیوان؟

لەم کەرکووکە، لەمەڵبەندی بابەگوڕگوڕ

شاری زێڕی ڕەش و شیعر!

پێشوازی تۆمان پێناکرێ

بەرگەی تۆفی زستان ناگرین

زووکە بارگەت بپێچەوەو لێرە بڕۆ!

ڕۆڵە جگەرگۆشەکانی ئەم مەڵبەندە بێ بەهارە

تۆیان ناوێ

منداڵە بێ بەرگەکانی ئەم شارە مات و بێزارە

دڵیان بە تۆ ناکرێتەوە!

ئەی بەفرەکەی ئێرە بڕۆ!

جوانی وسپییێتی تۆ دادی ئەوان نادا !

بوویان بوویتە مایەی مەرگ و دەردەسەری و نەهامەتی

لەسەرمانــا شپــرزەبوون، مـاونـەتـەوە بـە پێی پـەتی!

هەرچەند بەفر گوڵ ئاسایی

جوانی و پاکێتی لەگەڵ دێ

کۆرپەکانی کـورد ئـاسایی

قەندیل و هەڵگورد ئاسایی

بــۆنی نێرگـزی لـێـوە دێ

بەڵام سەد ئـاخ لەم سەردەمە

پـڕ چـەرمـەسـەری و ستەمە

بەفریش شەختە و سەرما دێنێ

زستانێکی بێ ئەمانی وەها دێنێ

کەس ناپرسی!

منالّی پێخواس و برسی

دەتۆقێنێ

کە بـەڕێـگا و بانـدا دەڕوا

لەهیکڕاو بێ ئیـزنی پاشا

دڕکی بـە پـێـدادەچـێـت و پـێی دەتەزی

لەحەژمەتی تۆف و سەرما هەڵدەلەرزی!

ئەی بەفرەکەی ئەم زستانەی

شاری شەیدای زەردەخەنە

کەرکووکەکەی

بووکی دەست و پێ بەخەنەی

ئـەم نیشتمان و مەفـتـەنـەی

پڕ لە وەیشوومە و گۆبەنە!

ئەی زستانی پڕ لە زوقمی

ئاشنای ئەم کوردستانە

پڕ مەینەتی و پڕ داستانە

دەزانی بۆ تۆ لێمان بووی بە بێگانە؟

لە مەڵبەندێ کە سەرچاوەی گڕی گشت ئاگردانێکە

تێشووی سەفەری باوەڕی گڕی هەموو سووتانێکە

سەرما مرۆڤ هەڵدەواسی

تەڕ و وشک دادەپاچی

زستانی پڕ نەهامەتی

لێرە بووە بە خانەخوێ

بۆ نەگبەتی، تەنها زمانی ترس دەدوێ

بەفرومناڵی ئەم شارەش بوون بەبیانی

هەرچەند زستان

دڕندەیەکی سامناک و نـاگەهـانـە

کەچی دیسان هەر لێرانە

وا لەسەرخاکی دڵی ئەم خەمبارانە
برین بە پێوە دەوەستێ
پاڵ بەرەو ڕەوەی چەقیوی گەل وەدەنێ
داستانێکی تری کۆڵنەدان دەنووسێ

هۆ ئازیزە تاقانەکەی دڵم گیانە
لەم زستانە پڕ قات و قڕی و تۆفانە
گەردەروونم وەک کوڵخانێکی جۆشدراو
وەک ئاگردانێکی تازە و نوێ داخراو
لە هالاوی ئەم ئاگرەی تیا نەبووایە
دەبوا هەر زوو جەستەم ڕەق هەڵگەڕابووایە
دەبوا تەرمۆمەتری ورەم بێتە خوار سفر و دابەزی!
گشت ئەندامی لەشی لەرو داهێزراوم هەڵ بلەرزی

ئازیزم تۆش وەرە بمگرە لەباوەشتا
گەرمی ترم پێ ببەخشەو
بمبە بۆسەر چیای سەرکەشی وشە و شیعر!
تا گیان و دڵ پتر لە جاران داگیرسێ
تا پەیامی هەڵسانی ئینسانێکی تر
بە گڕێکی سوور بنووسرێ !

وردیـــلەکان

منداڵــە بێ داڵدەکانی

ڕەحیماوا و ئازادی و شۆڕیجە و ئیسکان

بەسینگی ڕووت وقووتەوە

بەبرسێتی و بەپێی پەتی

وەرنە وازی

هاوڕێکانتان چاوەڕێنە

بێنە بەزمی دز و قازی!

وەرن بەم بەفر و شەختەیەش، گوێ مەدەنێ

تینی کـوورەی دڵی هـەڵ قـرچـاو بـرژاوم

دەبەخشم بە گیانی یەک یەکتان بەتەنێ!

تیشکی بیر و شەوقی جیلوەی

هەر دوو بـیـلـبـلـەکـەی چـاوم

پێشکەش دەکەم بەسۆز و عەشقی گڕداری

بـە کـیـژ و کـاری دڵـداری

ڕۆڵەی کەرکووکی مەفتەنێ

( منالی گەڕەک وەرنە دەرێ

پاشا بدەنە بەرخەنجەرێ

منـــداڵیـنـە وەرنـــە وازی

بۆ چاوشارکێ و زۆرانبازی!

ڕاپەڕن، هەستن لە خەوێ

بێچووەی شێر نانوێ بەشەوێ

منداڵینە چیتان دەوێ

هەمیشەبەهارمان دەوێ

نانی قەندەهارمان دەوێ)

منداڵینە

ڕووت و ڕەجاڵ و برسینە

کە دڵتان لە عەشقی ئەو بابەگوڕگوڕەی

هی ئەو گڕەی

دڵی منی تێدا بێ هەرگیز ناترسن

شیعردەڵێن و هەڵپەڕکێ دادەبەستن!

لە وازی گورگ و مەڕانێ وغارغارانێ

خۆتان براوەی یەکەمن، قەت نابەزن

لەبەرزوقمی بەفری هیچ تۆف و زریانێ

چۆک نادەن و هەڵ نالەرزن!هەڵ نالەرزن!

هەولێر ١٩٨٥/٣/٦

## پرسیار لە زەمان؟

هۆ زەمانە؟

خولقێنەر و لەناوبەری، بوونی جوانی لەم ژیانە

پێمان بڵێ بۆ تائێستا

بـارگـرانی و قـورسایی ئەم دەرد و ژانەی ئـەم جیهانە

لەسەرشان و پشت و سەری، پیل و ملی چەوساوانە؟

هۆ زەمانە ؟

پێمان بڵێ بۆتا ئێستا؟

چ لێرانە چ لەوپەڕی ئەم دونیایە بەرفراوانە

کردەی کارگەرەکان بـووەو

بــردەی ئەم بیرۆکراتانە؟

کردەی ڕەنجدەرەکان بـووەو

بردەی ئەم تاقمە کەمانە؟

هۆ زەمانە؟

کاتێ ئێمەی ڕەنج خوراوی ئەم جیهانە

بـە ئاواتی گەیاندن بـەژینی یەکسان

ژیـنـی ئازاد و کامـەران

ڕاپێــچ دەکــەن!

دەستەیەکی هەڵخەڵەتێن، بێرۆکرات دێن

تاقمێکی کەمی دڵ ڕەقی، خەڵک چەوسێن

بەدروشمی باق و بریقی! سۆز وروو ژێن!

بەری ڕەنجی شان و بازووی ئێمە دەبەن؟

درۆ نەبێ هەرگیز ڕاستی ناڵێن!

یاری بە دووارۆژمان دەکــەن!

خەونەکانمان ژێر پێ دەخەن!

هۆ زەمانە

لەم دونیایە پڕ ئازار و بێ ئامانە

ڕەنج خوراوان

ڕەتـێـنـراوانی کـوردستان

ڕوو لەکام قیبلەی نوێ بکەن؟

هەر قیبلەیێ ڕووی تێدەکەن

بەردەڕەشی ڕاستەقینەی لێ دەدزن!

هەر ئاواییەکی بۆی دەچن

بۆ بێگاری و خزمەت نەبێ ڕایان ناگرن!

کەی بیانەوێ ؟ گەر بیانەوێ!

وەک گاجووت و مەڕو بزن

کەوڵیان دەکەن، سەریان دەبڕن !

هەند بێسەر و سەرگەردان و گەوجێندراون!

بەخۆڕایی لەڕێی وەهمی چرووک دەمرن!

مخابن کە بۆ چەوسێنەریان پێناون!

بۆ ئەوانەی کەمتر لە جووتێ پێڵاون!

کارگەرەکانی کوردستان

چینە چەوسێنەرەوەکان

لەزمانی مافخوراوەکان حاڵی نابن

ئەوان بەسەرزاری نەبێ

بۆ قوربانی و مسکێنی و بێگاری نەبێ

ئێوە بەمرۆڤیش نازانن

هەند شەیتان و لەبلەبانن!

ڕەش بەسپی و ناهەق بەهەق

شەڕ بەئاشتی بەچەوساوەکان دەفرۆشن!

هەند بەدمەستن، بۆ مەرامی گڵاو سەرخۆشن

ئەوان بەسەر سەری ئێوە

تەڕادێنێ و سەیران دەکەن

ئەوان لە ژێر دروشمی ساختەی ناوی ئێوە!

بە خۆڕایی زەق زەق لە پێش چاوی ئێوە

ڕێکخستنی براکانتان

جەنگاوەرە هاوڕێکانتان

بەرەو مردن ڕاپێچ دەکەن!

بۆ ئاکامێکی ڕەش دەبەن!

لەبەردەرگای دیوەخانی هەر فەرمانڕەواو پاشایێ!

هەر ملۆزم و مێردەزمە و بەرپرس و کوێخا و ئاغایێ

هەر نۆکەر و بەچکە شێخ و دەست کەلایێ!

هەر میرێکی قۆڵبڕ و کۆلکە مەلایێ!

بە خەتێکی زل و زەبەلاح نووسراوە

"خودا بەردی گەورەو بچووکی داناوە"

ئەوەی بەشان و شەوکەتی

لێ هاتوویی و عەزەمەتی

حەزرەتی پاشا هەڵ نەدا

ئەشەدو بیللای باش نەکا!

زوڕنا نەژەنێ و دۆڵ نەکوتێ و نەدا خاوە!

زۆر بەڕوونی ماستاوی خەست نەگرێتەوە کڕنۆش نەبا

بەردەوام یان ناوەناوە، سەگوەڕ نەبا!

نابێ چیتر، لێرە بژی و نققە بکا

هۆ چەوساوە و ڕەنج خوراوی

کوردستانی جەرگ سووتاو

خاک لەتکراو، بن پێ خراو

منی هاوڕێی ستەم دیدەتان

لەم کەین و بەینەی ئاغاکان

بـه ئـاگام و ڕێـنـوێـنـی ئێـوەش دەکـەم!

مەینەتی خۆم لە گەڵ ئێوەش دابەش دەکەم

چیتر نەکەن!

بۆ بەرژەوەندی تاقمێکی نەفام و کەم و بیرۆکرات

ببنە سووتەمەنی خەبات

چیتـر نـەکـەن!

لـەبـەردەمی ئەم زاڵم و دەجاڵە مـەودا کورتانـە

مامە حەمەیی و مەرایی و ماستـاو بکەن!

چیتـر نەکەن لەبەردەمی ئەم کەمانە چۆک دابدەن!

نەکەن ..نەکەن بۆلەتێ نان، پارووی جەور

کردەوەی کەم، بۆ ئەو کەمانە ئەنجام دەن

بە پەمپ لێدان لەڕێی ئەوان، نابنە بەور!

هەرگیز نەکەن، بۆ بۆرژوایانی بچووک !

مەبنە کلکی قازمـە و تەور

بۆسیاسەتبـازی تەقڵەباز! بـۆ بیرۆکراتیانی چرووک!

بۆ سەری ئاشووب پڕ جەور، چۆک دا مەدەن!

نا نا هەرگیز کڕنۆش مەبەن! چۆک دامەدەن!

هەولێر ١٩٨٥/٩/١١

جەور: ستەم

## دوو هۆنراوە بۆ نەورۆز



منداڵینە بە داخەوەم منیش کە مامۆستای ئێوەم
بۆم ناکرێ نەورۆزێک سازکەم لە دۆخێکی ئا لەم شێوەم
لە چنگ فاشیستێکی پڕ قین ئاوس بە شەڕ و هەڵواسین!
کەهەست بەبوونی خۆت نەکەی چۆن تام لەجەژنی خۆت دەکەی؟
تا لە نەورۆزێکی باڵای بەرزی بێوێنە و ئەندازە
جەژن نەکەم بە ئازادی ناڵێم هات ڕۆژێکی تازە!
بشمرم لەم پێناوە دا گەر شەهیدیش بە پێوە
دەچمەوە بەگژ ئەژدیهای نادادی و ئەم چەشنە خێوە!
تا نەورۆزێک دێت میللەتی ئێمەی لەناودا دڵشاد بێ
جەژنێک بێ گشت چەوساوەی ئەم وڵاتەی تێدا ئازادبێ
نەخۆ ڕۆژێ لە ڕۆژانا لە نەورۆزەکەی خۆم دیل بم
لە تافی گەنجێتی ژیانا هەر پرسەبار و زەلیل بم
بەڵکو لە ڕێی کۆڵنەدانا خۆم چارەسەر و کلیل بم
لە ناو کۆڕی شاعیرانا لە لوتکە دا بم جەمیل بم!

١٩٨٥/٣/٢١

لەکوردستانی نوێ بڵاو کراوەتەوە کەمێ دەسکاریم کردووە

## منـاڵیـنـە

ڕووت وقووت و ڕەجاڵینـە

لـەم نـەورۆزە

دڵی ڕەنجاو و بـێـدارم پڕ بریـنـە

تـەژی سـۆزە

لەجیاتی خەندە و پێکەنین

جۆشی داوم گریان و شین

گەرچی گریانم خۆش ناوێ

ڕێم پێ دەگرێ تاو نا تاوێ

مناڵینە

کیژوکوڕی بێنازی ئەم خاکە جوانە، دڵغەمگینە

ڕەوشتێکی سەیرم هەیە

نازانم بۆچی ئەوهایە؟

لەناوخۆشی و شادیدا بم گریانم دێ!

لەناو تاڵی و ئەشکەنجە پێکەنینم دێ!

سروشتێکی سەیرم هەیە

سەرگوزشتەی من ئەوهایە
شێت نیم بەڵام ئەوساتانەی تووڕە دەبم، کەهەڵدەچم
لەشێت دەچم!
لەخاکی دابەشکراوی، کوردستانی لەت لەت دەچم
لە لاوی زنجیرکراوی، بەردەم سێدارە و پەت دەچم
کە ڕۆژ هەڵدێ
تیشکی خۆر لە ئامێز دەگرم
چاوم بەرپێی خۆم نابینێ
هوڕ و کاسم
لەداخی ئەم چەرخە دەمرم!

کە شەودادێ
بەفر و شەختە و تۆفانیش بێ، لای من بای دێ!
لە هیچ شوێنێ هەدا نادەم، ئۆقرە ناگرم
تا یارە ئازیزەکەم دێ دەرۆم وەکو با گڤقەم دێ!
پێچەوانەی شەوکوێرانم!
بەرەو دەشت و زورگ و تەلان و چیا دەچم!
عەودالێ ژوانی یارانم!
دەبمە تۆپەڵێ هەتاوو لە ئاگری نەورۆز دەچم!

نەورۆزی ١٩٨٥

## سروودی نەورۆزێکی تازە

دیسـان نەورۆزی کـوردانە بەهـارەکەی پەرێشـانە
وا کـورد سـتان ڕازاوەیـە تەمـای پێشـوازی کـاوەیە

هـۆ کـوردینە هە تـا کەی وا لە نەورۆزا دیـل و لا ت بـین
لە سەر خاکی باپیرانمان ژێر دەست وبـێ دەسـەڵات بـین

دەی هەمـوو یەکبن مەردانە ڕک و کینەی کۆن فـڕێ دەن
کـورد لە ڕۆژێکـی ڕەشـدایە لەم هەورازەی بە سـەر بـخەن

کـوتکی کـاوە بوەشـێنن ڕزگـاری بـۆ گەلتـان بێـنن
تـا لەم ڕۆژە ڕووی خـۆری نەورۆزێکـی تـازە هەڵبێـنن

بڕووخـێ کۆشـک و تە لاری ئەژدیهـاکی داگیرکـاری
وێرانبـێ قەڵای شـەڕخوازی جیهـانی سـەرمایەداری

هـۆ ژن و پیـاوی کوردسـتان ڕامـاڵن ئۆردوگـای تـاوان
دانیشـتن ئەمـڕۆ نەنگـی یە، بشـکێنن زنجیـری زیـندان

چەکی شۆڕش بکەنە شان   بڕۆن بۆ ناو کۆڕی خەبات
گیان بازی بکەن و سەرتان   بۆ نیشتمان بکەنە خەڵات

بەو ئاگرەی لە دەروون و  گیانتان مەشخەڵی هەڵساوە
بسووتێنن هەر شوێنێکی   وا ستەمکاری لە ناوە

بڕوخێنن  هە ڕ زوحاکێ   چڵێس و پیس و خوێنڕێژ بێ
بیە وێ داهاتووی کوردان،  ڕووی بەرەو هەڵدێر و لێژ بێ

تا ئەم جەژن و ئاهەنگەمان، بە یە کجاری لێ پیرۆز بێ
دوژمن ڕیسوابێ و کوردیش بە  شادی لە ئامێز نەورۆز بێ

هەولێر  نەورۆزی ١٩٨٥

## شەترەنجی ژیان

ئەم شیعرە پێش ئەنفال و کیمیا باران نووسراوە و لە نامیلکەی (سروودی نەورۆزێکی تازە ) دا هەیە، کە لە مەهاباد، ساڵی (١٩٩١) بڵاوم کردۆتەوە، لێرەکەمێک دەسکاریم کردووە

ساغ بۆتەوە لەم گەردوونە
کە بردنەوە: بە یەکبوونە
دۆڕاندنیش ؛ دابەشبوونە
شێخ و ئاغاو مەلای ساختە! دژی چەوساوەی بەدبەختە
هەندێ شەترەنجزانیش کاتێ ، گەمەیەکی شەترەنج دەکەن
شەڕە قۆچ و ململانێی فیل و ئەسپ و قەڵا و پیادەی
بە زرنگی تێدا دەکەن
لە بۆ دەستخۆشی و ئافەرین، بۆ پێکەنین
یاریەک بۆ کەیف و ڕابواردن هەربۆ ئافەرین لێکردن
تێکڕای توانای هەست و بیریان
هۆشی مێشکی سەودای سەریان
لە دار و بەرد و چیا دەدەن
پەنا بۆ بەر گشت کونجێکی زانستی ئەو یارییە دەبەن
تا پێشبڕکێیەک، گرەوێک، دەستێ شەترەنج ببەنەوە
ناویان لەڕیزی یەکەمی سەرکەوتوواندا ببیننەوە

هەندێ بە ناو یاریزانی سەرکردەی گەلی کوردیش هەن
بە خۆیان دەڵێن شۆڕشگێڕ یان دەمڕاستی ئەم میللەتەن

وا بــەردەوام دەدۆڕێـنـن  خـەڵک و خـاکیش دەتـۆرێـنــن!
بەڵام هەرگیز پێ لێنانێـن  چەند سەری خەڵک لەقوڕنێن!
ئـەوان زیاتر دەفیشکێنن! کۆشکی هیوای گەل دەڕمێـنــن!
لای ئەو سەرە بە تاڵانە!
گرنگ مانەوەی خۆیانە
ناو بانگی پڕ درۆیانە
لای ئەوان براوە دۆڕاوە!
دۆڕاو براوە!
لـەبـەر چاویان، ڕۆژێ، هەر چوار  وەرزی ساڵێ، بەهەزاران
خـەڵکی هـەژار و بـێـتــاوان  چ  لـە دێهـات چ  لـە شـاران
ببنـە قوربان، دەست کورتی و خۆویستی ئەوان
دەربــەدەر و ئــاوارە بــن   بـۆ گــوزەران  بـێـچـارە بـن
لەبـەردەمیـان سەدان ئەسپ و فیل و قەڵا، بکەوێـنـدرێ
دەیان بنکەش بڕووخێندرێ، کش! لە پاشاو وەزیر بکرێ
پاشاش بـمـرێ !
هێشـتـان خۆیان  یـاریـزانـن!
سەرکردەی نـەوجەوانـانـن!
حاشـا حاشـا! لـە دڵسـۆزی  نـەخـوازەڵا خـۆڕاگــربـن!
مەگـەر هـەرداوەتی قـازی  قەڵـەو یـان وێسکی و مامربن!
بێـشک  ئـەوان،  خـۆڕاگـری  پـلـە و پایــەن !
ســــەرەخــۆرە و مـێــردەزمــەن
مـردووی ناوبانـگ و سەرمـایـەن!

چۆن گورگی بەد بەشوانی مەڕ دادەندرێ؟
کەی کەر باری وڵاغی بەرزە هەڵدەگرێ ؟
خوا هەڵدەگرێ ؟کێ ئەو دارزینە هەڵدەگرێ؟
گەر سەرکردەی خۆبەزلزان هەڵی بگرێ؟
گەر گای بنە و دەغەزاری لەخۆبایی
هەڵی بگرێ !
ئەگینا کێ ؟
ئۆباڵی دابەش بوونی وای
ئۆباڵی ڕووڕەشبوونی وای!
لەمرۆژە پێ هەڵدەگیرێ؟

☆ ☆ ☆

ئەی سەربازە ئازاکانی
ناو گەمەی شەتڕەنجی ژیان پێشمەرگەی ئازا و پاڵەوان
بینەرانی لە خۆبردوو
جەماوەری ماندی ومردوو
ئەوا کات کاری خۆی دەکات
سەیرکەن چەند خێرا دەڕوات
کاتێ دۆڵی دێرین دڕا !
پشتێنەی سنوور چۆڵ کرا !
وامانزانی لە نەبوونی بەزم و ڕەزمی زوڕنا و دۆڵە!
کەچی دیسان وا دەساڵە بەبێ وچان، زوڕنا و دۆڵە!

بەڵام ئاوەدانی ئێمە هێشتا هەروا ڕوو لەچۆڵە!
چارەنووسمان تەمتومان و نارۆشنە بەدەست زۆڵە!



تا کار لەکار نەترازاوەو هەتا زووە
تاتروسکەی هیوا ماوە و ئاوا نەبووە
تا مێگەلی مەڕی برسی کوردی بڵاو
گەلە گورگ ڕای نەداوە، تێی نەداوە!
ڕمی خۆتان بچەقێنن
یاریکەرە نەزانە ترسنۆکەکان
خوردە بۆرژوا، قرچۆکەکان، ببەزێنن
ڕێگرانی شۆڕشی گەل دەرپەڕێنن!
ئاڵای یەکبوونی یەکجاری کوردەواری بەدەست بێنن
خۆری نەورۆزی سەربەرزی لە کوردستان هەڵ بهێنن
خۆشەویستی و گەل پەروەری بێ غەل و غەش بچەسپێنن!
بوونی وڵاتێکی یەکسان بۆ چەوساوان دامەزرێنن!

هەولێر ١٩٨٦/١/٣١

## سروودی بۆ پێشمەرگە

ئەی پێشمەرگەی شۆڕشگێڕی دوژمـن بەزێـن
ڕۆڵـەی کـاوەی ئاسنگەری چەکـوش وەشـێن

هــۆ نیشــانەی، ســەر بڵنــدی ئەم مــیللەتە
هێـــرش بەرە، ئەمـــڕۆکە ڕۆژی هەڵـــمەتە

بە سەر سـەر و لاشـەی خـوێنمژان سـەرکەوە
لــوتکەی چیــا، وەک خــۆر لە کەل بەدەرکەوە

ئەی ئـــاواتی نەورۆزی تـــازەی کوردســـتان
پـــارێزەری مـــان و یەکبـــوونی کوردزمـــان

قەت مەهــێلە داگیرکەرانـــی چـــاو چنـــۆک
ســاتێ ئـۆقرە بگـرن تـاکو دێـنە سـەر چـۆک

ئەی پێشـمەرگە گلێـنەی چـاوی چەوســاوە
تـــا تـــۆ هەبـــی، دوژمنـــان خە یاڵیـــان خـــاوە

کـاتێ دەنگـی تـۆی پڵینـگ دێ، خـۆ فرۆشـان
دەبـنە ئـاردی نـاو درك، بـۆ خـۆ حەشـاردان

وەک گەواڵـــــەی هەوری تـــــوورە، بگـــــرمێنە
مــوژدەی ڕزگــاری یەکجــاری بــۆ گەل بێــنە

هەولێر نیسانی ١٩٨٧

## نامەیەك بۆ بۆرژوا خاپەرۆكەكان

هـۆ بــۆرژوا درۆزنـەكان

هۆكاری دەرد و ژانەكان

كەچە سەركردەی خاپەرۆك

بۆ ئەوەی ببنە شۆڕشگێڕ!

دڵسۆزی گەل و نیشتمان، نەک زڕ و گێڕ!

دەبێ خۆتان لـە بـچووكی نـاوەوەتـان! دابـمـاڵـن!!

نەک بە دەمامكی شوانەوە، خەڵكی بكەن بە بەڵاگێڕ!

تاكـو دەنگتـان، ببێ بـە دەنگێكی دلێـر، هی هــەژاران

دەبێ بەسەر حەزی بچووكی ناوەوەی، پیستان زاڵ بن!

لەناوبۆتەی، سەنگەری عەدالەتی چەوساوان قـاڵ بن!

وای بــەقسە و خۆدەرهێنــان، بەلفە لێـدان!

جوینەوەی گۆتەی سواوە!

دروشـمـی درۆی ڕازاوە!

بـنـبـڕكردنی زۆرداری لـەسـەر كارگـەر و چەوساوان

چەند ئاسانە

هەر بۆ خەڵک بە كوشتدانە

ختۆكەی سۆزی ساویلكانە

كە بەكردار خۆتان سەرێكی چەپەڵن

باش دەزانم، كەدەزانن!

شێخی بەرماڵی ساختەباز و کەچەڵن
تەنها، بـەناو شوڕشگێـڕن
لەڕاستیدا چەوت و چوێڵن
دژی پێـشڕەفتی کۆمەڵـن
پڕ لە کینە و کۆنەخوازی و وشەی بریقەدار، فیشاڵن
برەودەری خێڵ پەروەری و پیا هەڵدانی کۆنە چاڵن!
قەت دیوتانە گورگ خزمەت بە مەڕبکا؟بـێگومـان نـا
ئەدی چۆن چینی بۆرژوا، خزمەت چینێکی جیا دەکا؟!
چـۆن ئـازادی بـۆ کرێــکاران فــەراهەم و بەرپـا دەکا؟
ئەی چۆن چینی چەوساوە بە، خوێنمژی متمانە دەکا؟
مەڕ چۆن بە چەقۆی سەربڕی باوەڕ دەکا؟
چۆن هانا بۆ بۆرژوای دوژمنی خۆی دەبا؟
بێ چەکوشی، تەور و بیـوری، دەست و قامی کارگەرانی
بێ هـوشیـاری ڕەنجـدەرانی زوڵم لێـکراوی جـیـهانی
دەرناچن لە بن پێی قازانجی نا دادی!
سەرمایە دزی سەدان ڕووی، دژ ئازادی!
بێ یەک بوونی سەر لە بەری کرێکارانی
قەت ناگەن بە؛ مافی بەختیاری و یەکسانی
سەردەمێکی جوانتر لەوەی دوێنێکەتان، سەرانسەری
نەفرەت لە سەرمایەی بەدخوو! لە خوێنمژی بێکار، نەبوو!
لـە خشـتـەبـــەری مـرۆڤـی ساکاری زۆر نـەدار نەبوو!

بــــۆرژوا ترسنـۆکـەکان  بنـکردە خـاپـەڕۆکـەکان
لە بچـووکی خۆتانـەوە دەڕواننە هەڵوێستی بەرزی
ڕۆشن فیکر و شۆڕشگێڕان، ڕەنجدەرە ئازا و مەردەکان
چەوساوەی قوربانی دەر و خەباتگێڕە بەکردەکان
بۆرژوا بێ سیفەتەکان
جــگە لە خوێنــدنەوەی تیــوری ماتریــالی ژیــانکردن
ئەوچەندین ساڵەی ناکۆک بووم، بۆ گوزەران لە گەڵ مـردن
دەرکەوت چەندە خۆپەرسـت و پاشـقوڵ گـرو زۆڵ و بەدن!
لە جوانی و شادی تێناگەن
لە شـۆڕش و دادپەروەری و ئـازادی مـیللەت هەر نـاگەن
دەرک بە خۆشویستنی خاک، ژن  و ژیان و عەشـق نـابەن
هەتــاکو هەن! بە بچـــووکی لەســـەر زەوی دەمێنـــنەوە
بەهــیچ کلـۆجـێ نــاگۆڕێن، بە ســابوونیش پــاک نـابنەوە
هەر بە تۆقیــوی و پــۆخلی بــۆ نــاو خــاک دەگەڕێــنەوە
تەنیــا مەرگ توانــای هەیە بۆیەکجـاری ســوڕگومتان کــا
هەر زەحمەتکێشی ستەمدیدە پێـی دەکـرێ ئیـدارەتان دا
چـەپــەرۆکی  پیــرۆزی پێـتــان ڕابگـا و تێـتــان هـەڵــدا!
ڕۆشــنبیری لە خــۆبردوو لە دەسـتی دێ چارەتــان کــا!

هەولێر ١٩٨٥

## بڵێسەی ئاگرێکی هەمیشەیی

گەر دەترسن بەدەست واڵایی بمدوێنن، بمبەستنەوە
بە قـەفی زنجیـری تاوان شەتەکم دەن بمپێچنەوە
تاکو بوێرن لە گەڵما بێنە دووان
بۆم هەڵخەن سێپێکی زیندان
ئازاترین قامچی وەشێنی پـاشا بێنـن دارکاریم کات!
لێم نەپرسێ کێیت وکێ نیت؟سەربەکام نەتەوەو هۆزیت؟
بەبێ پرسیارو بێ وەڵام، ئەشکەنجەم دات!
وەک ڕاوچی چۆن نێچیر دەگرێ پڕمداتێ و دەسگیرم کات
وەک بولبولێـکی باڵشکاوی نێـو قەفەس یەخسیـرم کات
هەربۆخۆشی و گاڵتەو جەفەنگ بمداتەبەر قۆنداغە تفەنگ
دەربەست نایێم، دەربەست نایێم
بەرە و ئاسۆ هەنگاو دەنێـم
بەقەد تەمەنی ئازاری
مێژووی گشت چەوساوەی دونیا سووتێنراوم
بەقەد هاژە وخوڕەی تاڤگە و
شەپۆلی هەرچی ڕووبار و دەریا هەیە تاسێنراوم
بەقەد هەواری کۆچەری
چی کوێستانی و چی گەرمیانی دونیا هەیە ڕاپێچراوم
مـن زامێـکی بـەژان هاتووی مێژوویەکی شێوێندراوم
ئازارێکی کەنەفت و لەش داهێزراوم
مەهابادی جوانەمەرگ و هەڵواسراوم

شێخ سەعیدو سەیدرەزای لەداردراوم
نەء ژیلەمۆی ئاگردانێکی سەرلەنوێ خۆشکراوم
نەء بڵێسەی ئاگرێکی هەمیشەیی، داگیرساوم

تاکو بتوانن لەگەڵما بێنەدوان
بۆم هەڵخەن سێدارەی تاوان
بەدکارترین جەلادی سوڵتانم بۆ بێنن، دارکاریم کات
دڕەندەترین قازی بێنن بڕیاری خنکانم بدات
پێویست ناکات لێم بپرسن، کێیت و کێ نیت؟
سەربەکام نەتەوە یان دەستە و گرووپیت؟
بەکووچە و کۆڵانی شاردا، ڕامبکێشن
جا بمدوێنن!
من خەمێکی تازەهەڵچووی
ئەم گەلەنیم
بەدەرزی و دەرمان چارم کەن!
بە ئاسانی تیمارم کەن
خەفەتێکی لەدەست دەرچووی لەخۆبوردووی دونیا دیتەم
برینێکی کولاوەی پێی منداڵێکی ئەم وڵاتەم
خوێنمژەکان بۆ نامناسن؟
جاشە بێ ئەرزش! گەمژەکان! دیارە ئێوە هوڕو کاسن!
داخی گرانم
من هەر هەوارێ دادەنێم
لە شارو دێی نیشتمانم
ڕەشەبا دێ
ئەستوندەی ڕەشماڵەکانی لە بێخەوە هەڵدەکێشێ
هێلانەی ڕەشوێڵەکانی بەسەر یەکدا دەڕووخێنێ

گەلەگورگ تاو دەداتە ناو مێگەلی
پەرش وبڵاو و بێ خاوەنم
بە هەر لایەک گوزەر دەکەم بۆ ڕەتێنراوی وەتەنم
بۆ کوێ دەچم
مەرگەوەڕێکی هەر لێیە، هەڵەتەم کات
کوێرە ڕێم پێ نیشان بدات!
بۆ هەرشوێنێ هەنگاو دەنێم
عیزرائیلێکی هەر لێیە گیانی هەژاران بکێشێ!
تەمەنی گەنجێتی گەلم وێران بکات، هەڵبلووشێ!
هێشتاکە هەر دەربەست نایەم!
بەرەو مەبەست هەنگاو دەنێم
چونکە پشتیوانەکانم ڕۆڵەی کۆڵنەدەر وخاسن
ڕێبازەکەی من پیرۆزە، ئەرێ ئێستاکەش نامناسن؟
من بە لایلایەی ئەو دایکەم
بە شیری مەمکی ئەو ئاسکە*م
نەبەردانە فرچک دراوم هەست وسۆزی پێ ئاوداوم
بە ئاوازە سیحراوییەکەی کوردانە پێی گۆش کراوم
دژی زوڵمی فاشیستەکان شێلگیرانە جۆش دراوم
هەتا لەم دونیایە ماوم لە گوێمدا دەزرینگێتەوە
هەر دەیلێم و دەیلێمەوەو دەیلێمەوە و دەیلێمەوە
من بەفر نیم بەباو باران گەرماو زریان، بتوێمەوە
خەباتگێڕێکی نەبەردی کوردی ئەم کوردستانەمە
سەرم لەپێناوی دانێم پێم وایەهێشتاش هەرکەمە!

هەولێر هاوینی ١٩٨٥

ئاسک : ناوی دایکمە
ئەرزش: نرخ

# هەڵەبجە هیرۆشیمایە *

* لەچللەی کیمیابارانی هەڵەبجە نووسیومە

هۆ خەڵکی ئـازادیخوازی، دانیشـتووی ئەم گـۆی زەمیـنە
تـەژی لــە شـەڕ و ئـاژاوە و پــڕ لە کینــە و سەربڕیـنــە!
گـوایــا ئـەمــە سـەدەی پێشـکەوتن و زانسـت و زانینــە
کەچی وا کوردی بەدبەخـت! کـوردی بەجـێماو بێتەخـت!
درایــتە بەر چەکــی کیمیــای دوژمنێکــی وا سەرســەخت
هەڵەبـجەی بـووکی نیشـتمان لەنـاو ژەهـرا گەوزێنـدراوە
عیلم و زانین، تەکنۆلۆجیا
بۆگەلێکی پەرش و بێدەرەتان تەنیا، بۆتە بەڵا!
سەیرکەن وا
هەڵەبجە بەبۆنی سێوی سەرمایەی بۆگەن خنکاوە!
گەردەلوولی ڕقی بەعسی و کیمیاوی پێـدا ڕژاوە!

هەڵـەبجـە خڵـتـانی خوێنـە و دونیاش قوڕقەپی کـردووە!
چاویان لەئاست قەتل وعامی، ئێمەی بێکەس، نوقاندووە!
هاوارمـان نـابیستێ هیچ کەس!چـون ویژدان باریکردووە!
دەنـا وا خـەڵـکی هـەڵـەبـجـەی
سڤـیل، بێـوەی
ژن و زارۆی بەستەزمان ولاو وپیریان
بە گازی خەردەل وسیانید پێنج هەزاریان

گیانیان بێ گوناح کێشراوە! تەرمیشیان بڵاوە لەم ناوە
ئەوە کردەوەی خوا نییە ئێوە بۆ ئێمەو سازداوە؟
بۆچی بۆچی؟ خوایە تاکەی؟ ئێمە دەخرێینە ئەم داوە ؟
ئەوە سەدەی پێشکەوتنە؟
یان سەدەی پاکتاوکردنە؟ قڕکردن، ئینسان کوشتنە؟
ئیمپریالیستی جیهانی هەر تەنها قازانج دەزانی
هەڵەبجە زامێکی قووڵە، تا هەن لێتان نابێتەوە!
ئەم کیمیا بارانەش هەرگیز لە بیر ئێمە ناچێتەوە!

★ ★ ★

هەڵەبجە هێرۆشیمایە!
کوردستان کێڵگەی تاقیگەی گشت زۆردارانی دونیایە!
ئەمڕۆ لێرە، ژیان، دووان، هەناسەدان قەدەغەیە
پرسەی پێنج هەزار مرۆڤی کوردی تەنیای هەڵەبجەیە
هیچ وڵاتێ لێی نەپرسین، نەیان وت ئێوە کێن؟کێ نین؟
بۆیە وا بە پەستی و ماتی، کوردستان گشت پرسەیەتی
نە موسڵمان نە مەسیحی نە کۆمۆنی و ڕۆژهەڵاتی
کەس نەی پرسی لە هەڵەبجە و لەکیمیاوی و کارەساتی
بە بەر چاوی هەموو دونیا وا بە کرێ تێدەپەڕی
نەیوئێن نەهیچ زلهێزێ دەنگێکی بۆمان هەڵنەبڕی

هاوارمان، ناگاتە گوێی کەس
با دووبەرەکی بەس بێ بەس
دەنا ئێمەی بێ پشت و کەس
دوژمن تووشمان دێنێ هەرەس
دەکەوینە ژێر دەست ناکەس!

١٩٨٨/٤/٢٦

## سەردانی گۆڕی ڕەنجبەر لەنەورۆزی نەوەت و یەك

ڕۆژی نەورۆزی ١٩٩١

ڕەنـجبـەرەکـــەی ڕەمـــزی سەربـــەرزی ونەبـەزیـــن
شاعیـرەکـــەی تینـــووی سەرفـــرازی کـــورد لـەژیـــن
هـۆ کاکەگیـان جـوانەمەرگە عەگیـدەکەی خـاکی کـوردان
مامۆسـتای شـیعری شـۆڕش وبەرخـودان و قوربانیـدان
جەربەزە خـۆڕاگرەکەی نـاو جەمـاوەر، کـونجی زینـدان
لــەم نەورۆزە پـڕ لە جـۆش و ڕاپـەڕیـــوە، هـــاتیمە لات
ئەم سـەردانەم وەک جـارانی تـرنییە هەر باســی خەفەت
باسی کۆست و ئازاری کـوردی بێبـاک لە کـۆڕی خەبـات!

نا ئەمجارە مۆژدەکی خۆشم هێناوە
وا داروبەردی نیشتمان خرۆشاوە
شایستەی باسکردنە بۆ بەرزی باڵات
بۆ تۆ و شەهیدانی وڵات
لووتی لەشکرەکەی عۆجە شکێنـراوە!
کوردی باشوور ئەمڕۆکە گشتی هەڵساوە

★ ★ ★

ڕەنجبەرەکەی زەحمەتکێشی کوردی دڵسۆز
شەهیدەکەی ڕێی نـەورۆزی بیـری پیرۆز

هەستەوە ئـەو گۆڕەی پتـر لە دەساڵە

تیای خامۆشە ئەو دەنگە بەرز و زوڵاڵە

تیای چاوەڕێی ڕزگاری دەکەی بۆ وڵات، هەڵ تەکێنە!

سەری وەکو بـەفـر سپیـت بـە بێباکی دەربهێنە!

تێر تێر باوەشمان پیا بکە!

یەکە یەکە ماچمان بکە!

بەزمانی شیعرە پاراوو

ئاگرینە گڕگرتووەکانت

لەم شانۆیە سەربەستەدا، وەک کەوی سەرشاخ بخوێنە!

بە تیشکێکی چاوەکانت

ڕێی تێکۆشانمان ڕۆشنکەو بەبێ پەروا بماندوێنە!

★ ★ ★

تەماشای لوتکەی سەفین و قەڵای دێرینی هەولێر کە

سەیری بڵێسەی شۆڕشی ئازادی کوردی دلێر کە

تەماشاکە سلێمانی

هەڵۆ ئاسا لە پیرەمەگروون، ئەزمری، خۆی دەڕوانی

خاڵەشەهاب، وەک شێر لەبەردەرگەی سەرا، ڕاوەستاوە

ئەسپی شۆڕشی تـاو داوە

فایق بێکەس وپیرەمێرد لەگەڵ گۆران

لە سەرگردی مامەیارە و سەیوانی جێی ژوانی یاران

هەڵپەڕکێیان دابەستاوە لە گەڵ شۆخ و شەنگ ولاوان

وا ئەمڕۆژی ساڵی تازەی ئەم بەهارە

یەکــەم جارە لــە وڵاتێکی ڕزگـــارە!

★★★

کاکە، کاکە

وا ئاووگڵی ئەم خاکە

گەڕاوەتەوە باوەشی ڕۆڵەکاکانی

وا گیانی قازی و بارزانی

وەک فریشتە بە ئاسمانی

کوردستاندا دەخولێنەوە

لەبەرزیدا وەکو مۆم دەتاوێنەوە

لەشادیدا وەکو گوڵ دەگەشێنەوە

★★★

ئیستا وا ئەحمەدی خانی

لەبادینان شیعر دەچڕی

بوونی کوردان لەسەر پرا دەلالی جوان دەسەلمێنی

حاجی ودڵدار

لــە شاری کۆیەی پــڕ ئازار

دەستی جەعفەریان گرتووەو

دەڕۆن بەرەو بابەگوڕگوڕی بریندار

ئێستاکــــه وا مامەڕیشـــــه، لەهێـرشـــــه،

هەڵدەکێشـــێ ڕەگـــی فاشـــیزمان لەڕیشـــه

وەرە ســـەیری مەشـــخەڵانی بـــابەگوڕ گـــوڕ

چـــۆن بە ئـــۆردووی دوژمنەکـــانی داوە دڕ؟

لە کەرکـــووکی تـــازە بـــووکی زێـڕی ڕەش ئەمـڕۆ هەرایـــه

شەهید ئەنـوەر وەکـو پڵینـگ، لە سـەر قەڵاکەی وەسـتایه

لەشکری بەعسی ئەنفـالچی، هێـتلەری سـەردەم شـکاوە

تەنیا لاکی بـۆ گەنیویـان لە مەیـدانی جەنـگ جـێ مـاوە!

ڕەنجـبەرەکەی ڕەمـزی شۆڕشـگێڕی وئیـرادەی نە بەزیـن

پێشـمەرگە ڕۆشـنفکرەکەی گەلـی جەسـته پـڕ لە بریـن

ئێستـا گیـانی بەرزە فـڕی تـۆو گشـت شـەهیدانی وڵات

وەک مەلی ئازادبووی قەفەس، لە کوردستان گوزەر دەکـات

ئێستا کوڕەکانی کاوە

پێشمەرگە گیان فیداکانی، دەسووڕێنـــــەوە لەم نـاوە

ئێستاکه باوکی شەهیدان

ئێستا حاجی ساڵح گۆران

چاوەڕوانی مامە دەکات

بێت مەدالیای پیرۆزبایی و کۆڵنەدانی لەبەرۆکدات

ئێستاکه دایکی شەهیدان

دایە ئاسک بە بێ وچان

له ناو گۆڕەکەی هەڵساوە

هەرپێنج فەرزە

دەست بە دوعا لە سەر بەرماڵ

بۆ پێشمەرگەی کورد وەستاوە

نوێژان دەکا چوار وەرزی ساڵ!

کاکە ئەمڕۆ

لە زێدە ڕەنگینەکەی تۆ

ئەستێرەی بەختمان لە تاقی، ئاسمانێ دیارە وەستاوە

نە بت ماوە، نە سەی دڕی فاشیستی چنگ بە خوێن ماوە!

ڕێی گڕی عەشقی پیرۆزی، چەوساوە و شۆڕشمان بگرێ!

هیچ بەربەستێ بۆی ناکرێ، ڕێگای بیری گەشمان بگرێ!

نەورۆزی ١٩٩١ ڕاپەڕین

# ڕەنجبەر کێیە؟

"چوار ساڵ دوای ڕاپەڕین"، پازدەمین ساڵیادی شەهید، نووسراوە...

وتیـــان ڕەنجبەرمـــان پـــێ بناســـێنە
کـــوڕی ئەو ئاسکـــە دڵ پـــڕ برینـــە
ڕۆڵەی ئەو بـــاوکە ســـاڵح گۆرانـــە
لـــوتکەی دڵســـۆزی وجەرگ بریـــانە
منیـــش پێـــم گوتـــن، گـــەلێ ئاسانـــە
ڕەنجـــبەر هەڵویســـتی بەرزی ئینســـانە
پـــێمان بڵـــێ ڕەنجبەرکـــێ یە ؟ئەوهـــا بە پرتـــاو لە ڕێـــیە؟
وەک تفەنگـــی وڵاتپـــارێز ئامـــادەیە و لە ســـەر پێـــیە؟
هەگـــبەی خەمـــی چەوســـاوەی ئەم کـــوردەی پێـــیە؟
ڕەنجبەر هـاوڕێی هەمـوو ئەوانەن وەک مـنن
لە گەڵ دز و وجەردە و تاڵانچیـــان دوژمـــنن!

ڕەنجبـەر هەرگیـز نـەمـردووە
ویـژدانی زیـنـدووی مێـژووە
جەستەی تێکەڵ بەخاک بووە
بەڵام گیانی لە گەڵمانە، بۆ یەک چرکەش نەنووستووە
لە چاکەو خراپەی هەموومان، ورد و درشتی بە ئاگایە

بەرە و لوتکە تەکان دەدا، ئەو هەرلە هەڵکشان دایە

لە خزمەتی چەوساوەی نیشتمان دایە

لێم دەپرسن ڕەنجبەر کێیە؟

ئەو بە تەوژمە لەو ڕێیە؟ ئەوها ئازاو لە سەرپێیە؟

خەمی هەژارانی پێیە، پیشمەرگەی بیری نوێیە!

شاعیریکی شۆڕشگێڕی لە سەرخۆیە

دژی شەڕی براکوژی و خۆبەخۆیە

ئامانجی ڕزگاری کورد وکوردستانی سەربەخۆیە

هونەرمەندێکی ڕەسەنی داهێنەرە

لە هەموو کات و شوێنیکدا ئامادەیە

کڵاوی "سەخرەجن" ی لە سەرە!

چاوی تیژی ئەم کوردەیە

بۆ کوێ دەچن؟ئەو ڕەنجبەرە

لە هەمووتان بە خەبەرە

ئەوەی چی بەخۆی شک نایێ

با نەترسێ! چی لێ ناکا!

قەلقەلاشک لەخۆی بەشک !

ئەوەی زۆری پێکوەناوە !

بە تۆبزی غەدر بردوویە، بەهۆدە پوولی داناوە!

ئەو پێویستی بە هیچ نییە، چییان لێ نابا!

تەنیا ڕووی هەندێ ڕەش دەکا

پارەکەیان لێ دەستێنێ و

بە سەر زوڵم لێکراوانی، ئەم میللەتەی دابەش دەکا!

تف لە چارەی خودی بێ دۆن، سەرمایەداری دز دەکا!

نەفرەت لە تاڵانچیانی مۆن، وڵات فرۆشی سەرکزدەکا!

ڕەنجبەر بۆ ئەوە شەهیدبوو، تا کوردستان شەهید نەبێ

تا منداڵی کورد هەژارو ڕووت و ڕەجاڵ برسی نەبێ

گەل دڵنیا بێ لە دوارۆژی سەرفرازبێ و ترسی نەبێ

ڕزگاری بێ لە بێ دادی بگا بە لوتکەی ئازادی

ڕەنجبەر بۆ ئەوە شەهید بوو، تا داگیرکەر لێرەلاچێ

هەرچی زوڵم و زاڵم هەیە، بنێژرێ ولە قوڕێ ڕاچێ!

تا نان و ئازادی پێکڕا لە کوردستان دەستەبەربێ

نەک ئاغای کۆن بەهی تازە بگۆڕین گەل قوڕبەسەربێ!

(ئەگەر کورد تێکڕا تێر نەبێ

چاوی ئازادی کوێر دەبێ!

کەمی بەرزو زۆری نەوی!

چۆن سەربەخۆو سەردەکەوی؟)

ڕەنجبەر کێیە؟

ڕەنجبەر هاوڕێی شەهید ئارام وجەعفەرە

عەبدولخالیق و ئەنوەرە

هاوڕێی گشت لێقەوماوانە، گیانی زیندووی شەهیدانە

خۆشەویستی هەزارەها

خەباتگێڕیماندوونەناس بەئاگای جەرگەی مەیدانە

ڕەنجبەر کێیە؟

وا چاپووکە لەگشت جێیە!

ڕووناکبیرێکی هەولێرە

بەشکستی دوژمنی ئەم کوردە فێرە!

ژیرو جەربەزەو بوێرە، چاوی تێرە

ڕەوشت بەرزە، ماستاو ناکا بۆ بەرژەوەندی تایبەتی!

کڕنۆش نابا، لە بۆ پارە وپوول و کورسی!

ڕەنجبەرکێیە ؟

ئەوها دەست پاک، دڵپاک، داوێن پاک بەجێیە؟

بێشک ڕۆڵەیَ ئەم هەولێرە، بەشمەینەت وغەریبەیە!

ئەم شارە غەدر لێکراوە دڵشکاوە بێ تەبیبەیە!

کەبۆئەوان، بوو بە پێشمەرگە بەچرا

تالەهەژدەی یازدەی هەشتا لە سواری هەسپەکەی گلا!

بۆیەکجاری لەگۆڕستانی باداوان

لە سەید مەعرووف داگیرسا!

هەولێری ڕۆشن کردەوە

گرەوی خۆ بە شەهید دانی بردەوە!

بەڵێنی خۆی بەجێ گەیاند

کەچــی ڕەنجــبەر، هێشــتا هەرنەحەســایەوە
ئێستاوئێســـتاش، هەر بە زویـــری مـــایەوە
چونکە هێشـتاش، نە کـورد ئـاڵای هەڵکـردووە
نەکوردستان، لە چەنـگ خـوێنمژان دەرچـووە
تا ئەم گەل و نیشتمانە، بەتەواوی ڕزگـارنەبێ
جەمیـل ڕەنجـبەر، لەگۆڕیشـدا ئـۆقرە نـاگرێ

با هەمووومان، بەدڵنیایی پێکەوە
هەڵسینە سەرپێ و هاوارکەین!
کولێرەی یەکسانی دابەش کەین!
ڕەنجبەر لە ئـازار ڕزگار کەیـن
تێکڕا بڵێین
بنوو ڕەنجبەر لە گۆڕەکەت بحەوێوە
ئارام بگرەو لێی پاڵدەوەو بحەسێوە
وا هاوڕێکانت بەڕێوەن
هاوبیرانت، بۆ ئامانجە پیرۆزەکانت بەپێوەن!

هەولێر ١٩٩٥/١١/١٨

# پەیامە مێژووییەکانی هەبوون ونەبوون[1]



## دۆزەخی هەبوون ونەبوون ★

لە وەتـی هەم هەسـت بە بـوونی کەسێتی کوردێنیم ناکـەم!

لەم سـەردەمەی سـفڵەگەری و سـەودا و سـازش گێـڕیم نـاگەم!

هەمـوو دەم هەر هەڵـێ هـاتی نـاو وڵات یـان پەراگـەنـدەم؟

کەی لەجـادووی هـزری دژوون؛گـۆتەی چەتوون؛خەسـاودەگەم؟

پەی بـە توانـای زوڕنـا ژەنـی کـوردی دەهـۆڵ دڕاو دەبـەم؟

کـوانێ ئـاهورا مەزداکەی زەردەشـتی تەمتومـان و خـەم؟

خواوەنـدی کـرداری چـاکەی میللەتـی بـن نیـر و سـتەم؟

خوایە کەهەی! کەی ڕەوایە؟

دووکەڵی ژەهری سەرمایە

پشتێنی ئۆزۆنی پساند !

تخووبی بەرزیتی بەزاند!

کلکدارێکی ناتیزەی گەوجی سەر شێت بە تەمایە!

---

(١) ئەم شـیعرەم لەسـەدەی بیسـت نووسـیوە.هەر خوێنـدنەوەیەکی بـۆ بکـرێ، دەبـێ ڕەچـاوی شـوێن و بەروارەکەشی بۆ بکرێ، ئەوسـا بـۆ چەنـد برادەرێکـی نزیکـی خـۆمم خوێنـدووەتەوە. "هەولێـر شـوباتی ١٩٩٨سەروەختی کوردکوژی و قاتوقڕێ"

بوونەوەری سەر گۆی زەوی  بفەوتێنێت بێ بڕوایە!

ئەوەکەی حاڵە خودایە ؟

بێدادی لە لوتکەدایە !

چەند چاو تررووکانێکی تر!

چەند لەخەوهەڵسانێکی تر!

سەدەی خوێن و شەڕی گڵاو

سەدەی پێـڵاو !

میکیـاژ، گوڵاو !

جێمان دێلێ بە ئەسپایی!

چیمان نەکرد بەیەکتری  بەخۆڕایی؟

ئەی چیمان کرد بۆیەکتری  بەخێرایی؟

کێ دەزانێ

ڕێچکەی ....

بوخچەی ....

سەدەی بیست ویەکی دادێ؟

چ زۆردارێکی چەپەڵی! کەللە پووچەڵی پێدادێ؟

کوندەی کینە و ژەهری پێ یە؟

یان شیلەی هەنگوینی نوێ یە؟

زەمەن بێڕەحم و بەغارە، پێشکەوتنی بێ ئەژمارە

قـەرەج  هـەر وا  کـۆلـەوارە

شاهەنشای بێ تەخت وکارە

هێشتا گا لەسەر ماسییە و زەمین لە سەر قۆچی گایە!

بێ ئەنـدازە ڕاگـیـراوە، ئـەم ئـەفلاکـە، لـەم حەوایـە!

زانای نەبینراوی بـاڵاو توانای بـەنـاو!بـزوێنی چـاو!

کانیاوی کەوسەری گیانی جوانترین جواناوی هەتاو!

لەگەڵ تارمایی وخەیاڵی ساختەی گومبوو، بمکە هاوڕێ

لە گەڵ ئەفسانە و هوڕێنە و خەونی مردوو، بمخەرە ڕێ

من ئەییووبی ئەم ڕۆژگارەِ بـەد مەزەب و پـڕ گومانەم!

ئارامگری، بێ چـارە و گۆڕەوشێردراوی ئـەم ژیانەم!

تەواو ئیدی سەرەمەرگـە بە حاڵ نووزەم لە بەرماوە

نەمـا ئـەو ئـارام و ئۆقـرە مێژوویینەی دڵ تـەواوە!

نهێنی بـوون و نـەبـوونی ئـەو دونیام، بۆ بدرکێنە

وەرامێکی ڕاست ورِوونی ئەو پرسیارانـەم بـۆ بێنە

بەسیە گەوجاندن، بەرپێنە!

سەرلێ شێواندن، تـرخێنە!

تا ئەو جەورەی لە کوردکراوە، سەربوردەکەی یەکاڵا بێ

تا ئەو دکرەی سەدان ساڵە، بە من دەکرێ ئاشکرا بێ!

کێ دڕندەیـە، بـەدکارە؟

بە گوناهی ئەنفالەکان

زیندە بە چاڵ، ژەهرباران

قـڕ کـردنی سەدان هەزار کـەسی کـوردان گـرفتـارە

بیکە سەر دەفتەری دۆزەخ ! بیکە نێو دەرەکی ئەسفەل

هەلاجی کە وەکو لۆکە، هەلا هەلا  لەت لەت، پەل پەل

ئاهۆراکەم، ئەی مەزدا گیان!

کەی حەزرەتی گا دەغەزرێ؟

کەی کەرەنای سوور لێدەدرێ؟

کە بۆت دەکرێ ئەم دونیایە لەناوببەی؟

دەپێم بڵێ بەتەمای کەی، تێکی بدەی؟

وەک دەفـەرموون!

لە ئاخیرەش،  دۆزەخێکی تر دادەخەی؟

گەر ئەو دۆزەخەش بڕیاری، موکوڕە هەر پیادەی دەکەی؟

بۆم بەیان کە؛ ئەمجارەیان نۆرەی کێیە و کێی تێ دەخەی؟

خەڵکی وەک من جەزرەبەدراو :بێ ئاڵا، بێ بوون،  بێ وڵات؟

پەڕپووت..نەدار و ڕووت وقووت،  ڕوولەنـەهات؟

یان شەیتانی خائین بێ بار ؟

هەبووی دەستڕۆیشتوی زۆرکار؟

خەڵکی چاو چنۆک کینـە دار ؟

پۆشتەی شەڕاوی  ڕیـز سوار؟

فیــزاوی هار؟

هەڵگەڕاوە و عــاسێ کە بەر بووەتە گیانی خـەڵکی هـەژار؟

هیلاک بووم لە بێ هوودەیی ؛هەی یاهووهەی،  پەرێشانی!

زۆر لە مێــژە شەونوێــژ دەکـەم، بـە ئاشکراو بە پـەنهانی!

تا لەم دۆخە دەربازم کەی، بۆ ئەو لاکەی جاویدانی!

بۆ بەهەشتی ترش و مێخۆش

بۆ نۆشینی خۆشاوی هەنگوینی دەستی، پەری ڕووخۆش

بۆ باوەشی پڕ لە میهری، مەیگێڕی تەڕ پۆش و پڕجۆش!

پڕ لە میوەی فەقیر نەدیو! بە بینینان ببم سەرخۆش!

تا بەجۆگەی شەڕابەکەی، مەست بم و پێی ببم بێ هۆش!

هۆ ئاهورا، ئەی مەزداکەی ئاوێستا بێ خودانەکەم

پڕ بووە جامی تووڕەیی ساڵانی چاوەڕوانەکەم

چما لە سەرچی ماتەڵی؟

کەی حەشرەکەی؟

کەی ئەم ئیبلیسە دادەگری لەسەرکەڵی!

داری شەڕی سەربڕین و زگ هەڵدڕی؟

گەر وا دەکەی

هەر وا دەکەی

دەی زوو بە زوو

بەبێ هیچ پرسیارو وەرام و سێوو دوو!

ئا ئەم بوونە لاپرەسەنگ و خوار وخێچ و نا تەبایە

ئەم دۆزەخەی کە لێرە بۆ ئێمەی خوادا جۆشت دایە

لەناو بە دەی!

بەسیە وەختی داخرانی ئەم نمایشە پێ ڕابوێرەیە دەی

خێرا ئەم وشکە کەڵەکە کۆتا کە دەی

ئەم ژینەی لای من بێکەڵکە، لە ناوبە دەی!

بە کون فەیە کونەکەی خۆت، تێکی دە دەی!

مەزدا گیان دەی! ژێراو ژوور و نغرۆی کە دەی!

تێکی دەدەی....! تێکی دە دەی....! تێکی دەدەی !

هەولێر شوباتی ١٩٩٨

★ ئەم شیعرە مامۆستا موعتەسەم عەبدولکەریم بەرزنجی وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی

پەیامی دووەم:

## تەکان بەرەو ڕابوونێکی ئەڤیناوی

پێشکەش بەجیهانی سەرمایەداری و عەولەمە

هەرچەند بەرەو ناخی دوورایی ئاسمانێ گوزەر بکەن!

جەنگی سێیەمی جیهانیش لە پشت زەمانێ جاڕ بدەن!

ئیقلیمگیری و جیهانگیری

ئەستێرەکانیش گشتگیری!

ببنە موڵکی هێزی سەرمایە و بەدفەڕی!

چەند پێ بگەن!

هەست بەبوونی خودی ! بەدی ! بایی بوونی خۆتان بکەن!

قوڵابگیری کاولکاری و ئاوەدانی

قاوغی پووچەڵ وقەپێلکی شارستانی!

ئەنتەرنێت و شۆڕشی زانیاری تازە و

بۆمبی هێدرۆجین، ئەتۆمی! دوامۆدێلی بێ ئیجازەو!

سەدان دۆزینەوەی دیکە و داهێنانی بێ ئەندازەو!

مانگی دەستکرد ! مرۆڤی خۆکرد ! ئەنجام بدەن!

پێشکەوتن لە ناوک بازی زەرە و فیزیا وکیمیا بکەن!

بەرەهایی پەی بە بوون نەبوون ببەن!

مەنتیقی چش!

تیوری بێ بنەماو فش!

کەندووی بەتاڵ!

هەبوونی پفدراو بە فیشاڵ!

دڵتان تاریکستانێکی چڕی وایە!

پڕی ماری دەعبای هاری نەپرژایە!

مێشکتان هەر بچکۆڵەیەو کەم بینایە!

چاوتان تەڵخ و گوێتان لە ڕاست هەق نووسایە!

کۆشک و باڵەخانە بەرزو جوانەکانتان

بچنەکەشکەڵانی فەلەک تاقی ئاسمان

بە پوولێکێ قەڵپ ناچێ !

تا هەر چی زۆرلێکراو هەیە

هەر چی مرۆڤی جێماو هەیە

لە بوونی خۆی دڵنیا نەبێ

ئاشتی بە هەق بەربا نەبێ

بە پەیژەی ئازادی و شادی بەرچاو ڕوونی هەنگاو نەنێ

ئەم بوونەتان بە هیچ دەچێ ! لە بناغەوە هەڵ دەکەنرێ!

تا نەیێنە سەر باوەڕی هەرە بەرزی خۆشەویستی!

دانەمەزرێ کۆمەڵگەیەکی زەمینی دوور لە پەستی

هەبوونێکی مرۆڤ دۆستی بێ چینگەرایی و ژێردەستی

....؟.....!....؟....! ....؟ ....!

سەر هەڵدانی ئەم ژیارە بێ عەشقێکی سپی بێگەرد

بێ پەرستنی سروشتی جوانی گیان لەبەر داروبەرد!

بێ یەکسانییەکی ئینسانی بوونی ژیاو !

تەواوتەواو

ئەمخۆخۆری و ئەم وەحشەتە

ئەم دڵەڕاوکێ زەحمەتە

دەبتە ئاردی

نا و دڕک و داڵی جەنجاڵی

مێژووی لە زەلکاودا خنکاو

زوڵمی بە فیشاڵ سەپێندراو

مەحاڵە هەر دادەتەپێ

سبەی دووەی نغرۆ دەبێ!

★ ★ ★

( خودی مرۆڤ که ساوابێ

خونچەگوڵی باخی خوابێ

پێش ئەوەی خوڵیا و مێمڵی

کاری خراپ و نـاڕەوابێ!

پاکە بەڵام، خوانەکا بۆی بلوێ بێتام بەرەڵڵابێ!

لە نێـوەندێـکی بـەدفـەڕ بێ

فرچکدراوی ڕووگەی شەڕ بێ!

ئەژدیهاییێکی حەوت سەرە !

لە مرۆڤـایـەتی بـە دەرە ! )

بێ ڕۆشنایی سۆزی ڕەهای ؛ دڵی پڕ لە عەشقی ئافرەت

بێ ئارامی و ئاسوودەیی گیانی مێیینەی بێ مەینەت

بێ زانستی

هونەری جوانی ناخ ناخی مروڤی بێ کینە و خەفەت

هـەنـاسەیـەکی وەڕسـتی دەمـامـک دراوی درۆیـە!

ژیـانـێـکی پـڕ خۆپەرستی و دەستخەڕۆیـە

چاوبرسێتی، هەڵپەی پووڵ ویستی بێ عاری

بێ تـام و بـۆیـە، نـامۆیـە

سڕبـوو بـە جورعـەی تلیاکی ئـایینداری

ژەهری فیشقۆلۆجی فیکری جەهلاندنی قەدیم دروستی!

سەرقاڵ بەوەهمی دۆزەخی گەمژاو بەخۆشی بەهەشتی

ئافەریدەی فریوکاری

جەللادێکی زێدەبایی  ناکەس بەچەی ناقۆڵایە

هەرەسێکی داتەپیوی  شوورەییە بـەرەڵڵایـە

سەرمایەداری و بێکاری و چی و چی و چی...؟

جەنگەڵستانی شەڕخوازی و پڕ نا دادی

حەزی نـەزۆکی زۆرداری و خـەتـاکاری

غوربـەتـێــکی زێــدەڕۆیی  ئەبەدیـیە، بـێ هـاوتـایــە

بەدبەختییەکـی مسـۆگەری   ئێسـکگرانی  بــێ مانایــە

لە ڕێچکەی مرۆڤایەتییەکی  سـەنگین وگران داکەلایــە

خودی بچووک و ترسنۆک!

خەمۆک،  ڕفۆک!

لەرزۆک،  بیژۆک!

جاڕس،  چڵکن!

منجڕ،  کوڵکن!

پەلکێش دەکا بۆخەرەندی گۆڕی بێ بن!

ڕووەو نەبوون،  نەبوون نەبوون!

بـەرە و چارەنووسی نـا ڕوون

تا ئەو خودە نا پـەسند و ملهوڕەتان لە ناو نەچێ!

ئەوسیستەمە قێزەونـە! بە یەکجاری

هەلا هەلاو تەفر و توونا و  نـغـرۆ نـەبێ

مەحاڵە ئەو نەبوونەتان  نابتە هەبوون!

بەسیە تا کەی حاڵی نەبوون؟

وێـران بـوونی ماڵی دەروون ؟

تەکان....تەکان.... بەرەو مرۆڤێتی ئینسان!

زانی ویـــژدان !

تاکو چیتر هەست ونەست و جەستەی ژنان

لەمەیخانە و تیاترۆخانان ..هەڕاج نەکرێ

لەجامخانە و میدیای هەرزان هەڵنەواسرێ

لە بەناو پەرستگە و ماڵی پیسکە پیاوان ئەتـک نەکـرێ!

لای شەرەفسز! بەسەبایا و کەنیزە و ئەنفـال نەبـردرێ

تا ڕۆحی سەرجەم مرۆڤەکان لـەڕەگەوە نەڕووشـێندرێ

تێکڕای ئینسان دەرباز بن لە دڵەڕاوکـێ و ژێرچەپـۆکی

ژانی ژینی؛ دەردی بێ بنی خەمۆکی

حوکمی پڕ لە چەوساندنەوە و غەدر و تاوان

ڕابـــوونێکی ئـەڤینـــــاوی بێ چاڵ و قـۆرت پەیـدا ببێ

هـەبـوونـێکی مـرۆڤ سالاری

بێ زوڵم و فیـزە و پاسەپـۆرت بـەرپا ببێ

تا حـەسوودی و ڕق و کینـەی قـرێـژاوی کـۆتـا ببێ

"من هەمبێ وخەڵکیش بۆدۆزەخ" ببڕای ببڕای ڕیسوابێ

ئەوسا هەمە ڕەنگی گۆڕ بۆ "خودی ونبوو" هەڵدەکەنین

هەمئاهەنگی بە "چەرخێکی سەرنوگومبوو"، پێدەکەنین

"موڵکداری "و "ڕەگەز سالار"ی " سەرمایەداری " ئەودەمە

نـەتـەوەچی فاشیستگەری "ئیمپریالیست "و "عەولەمە"

دەبنە مێژووی نالەباری و شەرمەزاری و خەوش و گەمە!

کەئەمانەش تەفر و توونبوون

دەچنە "مۆزەخانەی نەبوون؛!

بەختەوەری و دڵخۆشی وخۆشگوزەرانی

دەبنە بەشی هەمیشەی ژینی ئینسانی

هەولێر نیسانی ١٩٩٨

## پەیامی سێیەم

## بوونەوەرێکی عەنتیکە لە ئەستێرەکی بەجێماو !

"ئەو پەیامە شیعرییە خەیاڵئامێزەشم لە سەدەی بیست، لەداخی کوردکوژی نوسیوە".

"پێشکەش بە کورد لەهەرکوێیەکی دونیا هەن"

هۆ سەرمایە گوزارانی گڵۆبالیزمی ئەمڕۆی جیهان

خاوەنی پێشکەوتووترینی تەکنۆلۆژیای زانستی ژیان

گەر ئەمجارە سەفەرتان کرد لە ڕوانگەی گەردوون ناسییدا

لە وێستگەی باڵا دەستییدا

گوزەرتان کرد

بە تریشقە تازەکانتان بە مانگە خۆشبەزەکانتان

وەک بروسکەی هەوری خوایی! بە دەست و برد

ناخی ئاسمانتان کون بە کون! لووس پشکنی!

لە پڕێکا

لە قوژبنێکی لاتەریک، تەم و مژاوی و نارێکا

ئەستێرەیەکی پەرگەندە و بێ خودانی★!

کزو بێ هێز، دوورەپەرێزتان دۆزییەوە!

"ئەڵڵا ورمان لە جێی نەرمان!★"

نەڕژێ هێزە و تێڕ و هەمبان!

تووڕ درابووە دوورترین شوێنی !

تـاریـكایی كـەونی  یـەزدان !

خەڵكێكی سادە و غەریبی سەرسوڕمێنتان لەسەر بینی!

پەز و بزنی ! لەڕ و لاوازتان تیا بینی!

بــێ  دوو دڵی  بیـانناسن!

لێیان مە پرسن خەڵكی كوێن؟

هــەر بینیتان بێ پێناسن !

خۆیــەتی دەق !

ئــەو عاجباتیەی لەوێیە ! كـورد زمـانــە!

چەندیـن جار هەر ئـەنفال بووە

دراوەتە بەر پەلاماری هــەق و نــاهــەق !

ماڵوێرانەی مێژووەكەی  بە سەرچووە !

كەوتۆتە بەر  ژەهری خەردەڵ،  شەق وپێلەق !

بەستەزمانەی وەتی هەیە

پەللاری قیرسیاو بــووە

قوربانی ئەم و ئەو بــووە

قەت پەندی وەرنــەگرتووە

بۆتە عیبرەتی زەمانــە!

لەبەر شكست و براكوژی و

كیمیا و تاڵانی بێ وچان

لەژێر چەكمەی داگیركەری

كۆن وتازەی لەمەڕ خۆمان ..

میللەتی خەم !

دیسان کۆڕەوی فەرمووە!

ئەو ئەستێرە گۆشەگیرو بەجێماوەش!

کوردستانی بزر بووە!

یەکەم سەدەی دوای بیستەمینی زایینی!

بێ تێڕامان لوولی داوە و

ڕاپێچی ئەوێی لابەلای، خەونی ئـــــاڵۆزی کــردووە!

ئاخۆ دەبێ لەم سەدەیەش ئەم کوردە هەرسەرگەردان بێ ؟

ئەم وڵاتە لەت و پەتەش لە بوونی خۆی بەدگومان بێ ؟

سیڤەرێکی قەلەندەری هەڵپەسێردراوی شەیتان بێ ؟

لۆزانێکی هەڵگەڕاوەی، ڕۆژئاواو ئالی عوسمان بێ ؟

مەهابـادی بێ فریـادی خنکاوی زوڵمی زەمـان بێ ؟

جەزائیری حەفتاو پێنجی سەددام و شاهی پیلان بێ ؟

پەڵەیەکی ناشیرینی تەختی تەوێڵی ئینسان بێ ؟

☆ ☆ ☆

من نازانم بۆچی لێرەش

هێشتا لە سەر ئەم ئەستێرە، دەربـەدەرەش نیگەرانـم ؟

لەم سەدەی بیست و یەکەمە و لەم دەڤەرەش بە گومانم؟

خوانەکردە لەکۆشی ئەم پارچە عەردە بێ مەفەرەش

لە بەر زرم وهۆڕ و ڕمبەی خزم وخوێش!

ببتە بشێوی و هەڵێ هات!

بگره و بکوژەو ڕاکێش ڕاکێش

نـەخـوازەڵا قـەزا و بـەڵا

بێچووی حاڵ و سوغره و نزا

وەک ئاگری ژێر خۆڵەمێش

وەک تەنی بن مەنجەڵی چێشت

هەر دیتت لێرەش خوێنیان ڕێشت

چ بکەم ئەوجا؟ قوڕی کویێ بکەم بەسەر خۆما؟

هەنجەتی تڕ نانی جۆیە

گێچەڵی کورد خۆبەخۆیە

بە خێشە خێش!

یان خێرا چاویان بێتە ئێش

عەلۆ و خەلۆ وقالە وخلە!

دیسانـەوە هـەقـایـەتی

مێش وگامێش ! بەیتی بلە !

خوانەکردە ئێرەش ببتە؛ هـەرا و ئـاژاوە و کێشمە کێـش!

کۆنەقینی برای خەنجەر لەدەست یان هەردەم نیوە کێش!

مام وبرازا و خاڵ و خوارزا

پوور و پوورزا و خزمی تازە!

خۆ پارێزی ئاگرە سوورە

دادیان نەدا، لە خۆم دوورە

بە یادی گۆڵمەزی جاران!

نه بایان دیبێ و نەباران

پەتای جەلالی ومەلایی !

کوشت و بڕی، شوونەواری !سەر زەوی دایکە نیشتمان

ڕایانکێشێتەوە مەیدان بۆ شەڕگەکانی کورد قڕان!

قەتار قەتار چەکدار بەغار، سەنگەر لێدان

دایکی کوڕفەوتاو لێو بەبار

دەست لێک بەردان

بەکرەجۆ و ڕانیەوهەکاری شەست وچوار، مەسیف، بادینان

سی و یەکی ئاب و دەبابەی بەعس و جەندرمەی بێ حیساب

ڕاجیمەی پاسدار بێ شومار، ڕاوە دوونانی بێ کیتاب

ئەوسا بێ فریادرەس تەنها

لێرە! چی بکەم خوای بێ هاوتا؟

لەوێ! جار جار لە سەر زەوی! ئاشتی دەهاتە سەردانم

لێرە ! تۆقیوم گەر نەیێ ؟ چ کارەساتە مێوانم ؟

خوانەخواستە، لەم شەوەزەنگە نەهەنگە!

لەم ئەستێرە خەیاڵپڵاوە لاپرەسەنگە!

ببتە هەڵڵاو بگرە و بەردە!

شاڵاوی شەلم کوێری ئەم چەشنە جەردە دەست پێبکا!

کرمنی و ناکۆکی براکان ! ئەتک و بوختان سەرهەڵ بدا !

هێزی ئاڕ ئاڕ بینەوبەردە!

گۆنگەری تیرۆر و تاڵان

مار پێوەدان بێرەش بگا

چی بکەم ئـەوجا ؟

بە فیتی ئەقڵی سەقەتی

گیرۆدەی هەر هەمان دیرۆک!

هەمان لۆژیکی خێڵەکی

وا بەستەی بەگزادە و بەرۆک!

بۆ پارەو پوول و بۆ کورسی بێ هیچ هەڵوەستە ومەترسی

بـە شەوقـەوە بیکەنـەوە شـەڕە قازیفـە و بیکـەیسی

کەس لە ئازادی و دواڕۆژی کوردو کوردستان نەپرسی

کەس لەمەرگی براوکەسی خۆی لەشەڕگەکان نەپرسی

ئەوجا لەدەست بەجێماوی و بێ جێماویم بۆ کوێ هەڵێم ؟

لەم غوربەتی و بەد بەختییە دەردی کاریم بە کێ بڵێم؟

لەم بێدادی و گومڕاییە کەس گوێی لە دەنگی مـن نییە

لەم بێکەسی و نامۆییە چارەی نەگبەتی من چییە ؟

هـاوار هـاوار ....

هاوارێکی بێ سەدا و یار، هاوار بۆ خۆم!

بوونەوەرێکی عەنتیکە و بێ سەرم هەر، خۆم خۆم دەخۆم!

هەولێر ئاداری ١٩٩٨

★بێ خودان : بێ خاوەن

★ئەڵاورمان لەجێی نەرمان: نزای سەلامەتیە

### پەیامی چوارەم:

## خەونی بە مرۆڤبوونی مرۆڤ

"پێشکەش بەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی"

شەوێك لە خەونێکی ڕەوا

دڵ پڕ جۆش وخرۆش و نەوا

لە گـەڵ کۆمەڵێ هـاوەڵی

مـرۆڤ پەروەری بە بـڕوا

بەهەشتاوی و بە سەر قاڵی

چوومە بەردەم دەروازەی خوا

بە گریان و پاڕانـــەوە لە بەخشندە و گەورە و توانا

داوام کرد ئەو ئەهریمەنە نەگریسەی ببەستێتەوە

دەوری لێ بستێـنـێـتـەوە!

لەو خەونەمدا ؛ بانگەوازم دەکرد ئـاوا

خوا گیان! خواگیان ! با سەدەی بیست ویەکەمین!

ســــەدەی هـەزارەی سێیەمی ؛ مێـژووی زایین

ببتە سەدەی خۆشەویستی ڕەهای تێکڕای مرۆڤی زەمین

پاکیزەیی و جوانی و شادی

لێ بوردەیی و داد پەروەری

تێکەڵبێ بەجوولەی خوێن و

دڵی پـڕ عەشقی خاوێن و

هەناسەی ئینسانی بێ قین

با خۆشی و خەندە و پێکەنین

ببته سیمای سەردەمی بێ چەوسانەوە

زیندە بەچاڵ بێ خەمۆکی و گریان و شین

دنیـا ببتـه نیشـتمانی سەرتاسـەری بـووژانـەوە

ئاشـتی تەواو، حەزی ڕەواو ڕەهـا ڕەهـای حەسـانەوە

کوردستانیـش بـە ئـاڵاوە شـاد و واڵا بـێ و ڕازاوە

بـۆ مرۆڤـی ئەو سـەردەمەی چاوەڕێیـن بێـتە ئـاراوە

ببته پیرۆزترین جێگەی! ئـاینگەی سـەر ڕووی دنیـاوە!

قیبلەی عەشقێکی گرداری هەمیشەیی

بەهەشتێکی گیانی گیانی نموونەیی

پڕ لە باخ و پڕ لە جوانی ئەفسووناویی

لەوێ بە سەربەستی ژیاو

بێ ترسان لە گرتن و ڕاو !

لە دۆزەخی ئەتۆمبازی و پیلان و داو!

لەسەرجۆگەی هەنگوین، میوەی قەت نەخوراو!

ئاوی حەیاتی کانیاوی کوردەواری بخۆینـەوە

تا یەکجاری بە زیندوویی و بە ئازادی بخولێینەوە

تـا لە سـەر ئەم خـاکە پـاکە و لە باوەشـیا

دوور لە ئـازار، ئاسـوودە بسـووڕێیینەوە

مرۆڤی تێـر ڕەوشـت بەرزی و تێـر بـڕوا بـین

پڕ لە نەشـئەی سـەرفرازی و تێـر هیـوا بـین

مرۆڤی مرۆڤ بە بێ ڕیایی و....

ساختە و دووڕوویی و مەرایی و....
نەک وەک ئێستای پڕ غەدر و کوشتن و بڕین
بژین بۆ ژین  تەژیی لە ئاشتی و تەبایی
سروودی بوون بە مرۆڤبوون
بۆ نەمری و شادی بچڕین
بـا بە دڵە ڕاوکـێ و ژەهـری ئیرەیـی و خەمـۆکی نەمـرین
بـۆ دڵنیـایی بـوون بچـین  بـۆ چارەنووسـی ڕوون بچـین
دەستتان بخەنە نێو دەستم تا زیندوون بێن بەرەوهەبوون
بەڵێن بدەن، چ دەستڕۆیشتوون چ زەبـوون، تـا تێنەچـوون
خێـرا و پێکـڕا، وەک مرۆڤـی بـاڵا و بـڕوادار ڕەفتـار کەن
خۆتـان لە مەرگـی نـابووتی دژە مرۆڤـی ڕزگـار کەن

تا ئەم بوونەش نەبتە نەبوون
ئازاد بژین لە تەك هەبوون
گەر وا نـەکەن
زۆر بە تامەزرۆیی و بڕوا، بڕیار نەدەن
هەر وا نـەکەن
هاکا خێرا ئەم گەردوونەش نغرۆ دەکەن
تێـکی دەدەن!
بە ناڕەوا ئەم بوونەش بە نەبوون دەدەن
تێکی دەدەن! تێکی دەدەن!

هەولێر  حوزەیرانی ١٩٩٨

## سروودی بانگی ئاشتی و خۆشەویستی(*)

کوردە دەی یەکبگرن، دەردە؛ دوو بەرەکی و دڵڕەشی
بابەس بێ براکوژی و ژەهری پارە و کورسی و بەشبەشی

هەر بە خۆشەویستی و تەبایی، دەمرێ خۆپەرستی
بەدیموکراسی و ئاشتەوایی، دەردێ ڕیشەی پەستی

لەناوبەن میکرۆبی خۆخۆری و ڤایرۆسی چەکبازی
تا هەڵبێ گەزەنگی ئازادی و خۆری سەرفرازی

بەرپاکەن دادوەری و بڕوێنن، بیری سەربەخۆیی
ئەی کوردی بێ ئاڵا، مەچۆ بۆ شەڕی خۆبەخۆیی

وەرن بۆ باوەشی گفتوگۆی؛ جەرگسۆزی و پێک هاتن
تا گەنجی کورد پیشەی نەبتە دەست بەتاڵی و هەڵاتن!

دەردە بێ دەوڵەتی تا ئێستا و شەرمە بێ زانستی
کوانی گەل پەروەری و خەباتی سەختی خاکپەرستی؟

با ئاڵای یەکبوونی کورد زمان هەڵبکەین لە دڵمان
ڕیسوا کەین ناحەزی ئاشتیمان بۆ بەرزی کوردستان

هەولێر ١٩٩٨/٢/١٥

---

(*) لە ژمارە دووی گۆڤاری نووسەری نوێ ساڵی ٩٨ بڵاو کراوەتەوە، کەمێک دەسکاریمکردووە...

# چەند فرمێسکە وشەیەك بۆ پەژار(*)

ئای کەساتێ

مرۆڤ هەواڵی ناکاوی مەرگی دۆستێکی دەگاتێ

چۆن دەشڵەژێ؟

بە نەمانی پەژارێکی ورە بەرزی چەشنی چیا چی بەسەردێ؟

بەفەوتانی ڕۆشنبیرێکی هاودەمی

مرۆڤدۆستێکی هاوخەمی گڕێکی داخداری یاخی

لە ناخیدا دادەگیرسێ

کە ئازیزێکت وا خێرا جوانەمەرگ دەبێ دەمرێ

گریانێکی وڕکن، تووڕە یەخەی ڕۆحی پەستت دەگرێ

خۆی بوو هاوڕێی وشەی ڕەسەنی کوردی بوو، خۆکردی بوو

ویژدانی ڕاپەڕیوی ئەو خەمی درشت و وردی بوو

هەمیشە زیکر و ئەحواڵی ئەو شاعیرە هەژارە بوو

خۆشەویستی و فیداکاری ئەو مستەفا پەژارە بوو

بۆ کوردستان

لە ساماڵی زیوینیش دا

---

(*)"لەکۆڕی چللەی ماتەمینی مستەفای پەژاری شاعیر، لەهۆڵی ڕۆشنبیری هەولێرخوێندمەوە، گۆڤاری کاروان ڕێکیخستبوو."

شەستە باران و ڕەهێڵەی دادەباران
بەسەرخاکی لەتکراو و بێ ناونیشان

خەمەکانی خۆم کەم نەبوون تۆش بەخێربێی ئەی پەژارە
دۆستی هەڵوێستی بڵند و شەهیدی سەنگەر، سێدارە
کۆچی ناوەخت و غەریبت ئۆقرەی لە بەرما بڕیوە
چ کۆستێکە بزربوونت ڕاستییە یان خەونم دیوە؟
تۆ بۆ گیانت تەسلیم دەکەی؟ هانا بۆ بەرمەرگ دەبەی؟
ئەی بە تەمای ململانێ و خۆڕاگری
چەند دەیەیەکی تر نەبووی؟
ئەی تۆ نەبووی لە ڕۆژانی قات و قڕی
لە دژی مردن وەستابووی بە بێ باکی؟

تۆ فێرخوازانت فێر دەکرد
تێبکۆشن بۆ بەرزی کورد
فێرت دە کردن، هۆیها لە داگیرکەرانی وڵات بکەن
بۆ ستەمکار و خائینان کڕنۆش نەبەن
تۆ دەتفەرموو :جاش قەڵەم قەت پێم ناوێرن!
لە ئاست وشەی ناقۆڵام دا کز و کوێرن
شەلم کوێرم یەکێکیان لێ نا بوێرم، نا هاوێرم!
لە مەیدانی هەقخوازیدا بە تەنیاش بم هەرخۆم شێرم!

١٩٩٩/٤/١٥

## کیژۆڵەی کوردستانی

### شیعرێکی لیریکییە

کیژۆڵـــەی کوردستــانی خــۆت لێــم مەکــە بیــانی
هـــەر ئـازیــزی جـارانـــی قـــەدری تـــۆم تــازە زانــی
وەک پەپووڵـــەی بــێ بـــاڵم بــۆ شـیلەی گـوڵ دەنــاڵم
ڕەحمـــێ بــکە بـــە حـــاڵم عـەبـدالی چــاوی کـــاڵم
دەمبینـــی کە دڵ گیـــرم بە ڕواڵـــەت کـــە فـەقیـــرم!
بە دیـنـم، بە عەشـقی تـــۆ شـەهیدم بە دەسـتی تـــۆ!
دەروێشــی دەرگــای تۆمـــە یــاری خــۆم هەر بــۆ خــۆمە
هـەمیشـەکـــە ڕۆڕۆمــــە خەمــی دووریــیەکەی تــۆمە
دەمێکـــە دەنگــت نـایـــێ نـایـــێ دەنــگی چ نـایـــێ
لەم ســەیران و خۆشــییە بێبـــەش بیـــن بــێ هۆشییــە
شەبەق سەر لـە بەیـانی نـوێژ دەکەم بـۆ خـوای جـوانی
پاشـــام گەر تـۆ بێـیتـــە لام قـەبــووڵ دەبـــێ ســـکاڵام
بـــە دەرکــەوتـنـــی بـــالات دەبــووژێــتـــەوە وڵات!
غـەم و پـەسـتی و نـەهاتی کـۆتـایـی دێ کــە هـــاتی
لە "بوتـگە"*ی دڵـت مـەستـم خـەریکبـوو بـتـپـەرسـتـم
بـەدیدەنی سـەرتـاپـات دڵــەی شـێت، ئۆخەی دەکات

هەولێر ١٩٩٩

*بوتگە : بتخانە

## حەیرانێك بۆ هەولێر

حەیران لە پیرە هەولێرێ

خەم دێ و بەخەمێ قووڵتـر و پڕ لە ژانتـرم دەسپێـرێ

بەم ڕۆژی جەژنی نەورۆزە

خەڵکی لەگەڵ یەک دڕدۆنگن ئاشتی کۆمەڵگا ئاڵـۆزە!

دەستی ئەنقەستی شەڕخوازی

بە داهاتووی نـاڕۆشنم ڕادەبوێرێ و دەکا وازی

زێدەکەم خۆشترین شوێنە

ئـاوی کانـیـاوی زۆزانی ڕۆشنـتـرە لـە ئـاوێـنـە

کەچی هەروا لە ژێـر هەڕەشەی دوژمنە

بەشی ئەم کوردە داماوە شەق و جوێنە

خاکەکـەشمان دابەش دابەش، خوێناوی و پچڕ پچـڕە

بەهۆی سەرکردەی منجـر و خۆپەرسـت ونجـڕ ونجـڕە

کوردسـتانەکەم شـەهیدی ئەنفـال و غەدری زەمـانە

مخابن وێرانـبێ چیـدی بەسیە ئاشتی بۆی دەرمـانە

هەولێر شێت و شەیداو وێڵی ئازادییە

واوەیلای جەژنی شادی و ئاشتەواییە

دەستە خوشـکی مەهابـاد و کەرکـوکە هـی سـنە و وانە

هــی قامیشـلۆ و مەریـوانە بینـایی سـلێمانی جـوانە

هەولـێـر گوڵـێـکی ئازیـزە پایـتـەختی کـەسەرە، زیــزە

قەڵاکەی سەرچاوەی سۆزە مێژووی عەشقێکی پیرۆزە

نەورۆزی ٢٧٠٠ کوردی - ٢٠٠٠/٣/٢١

## لێم ببوورە(*)

لێم ببوورە....

هەستی من لەگەڵ ویستی تۆ گەلێک دوورە

ئاسان نییە وا بە خێرایی بتوانم

بەحەزی تۆ بچمەوە دۆخی جارانم

لەم ماڵەدا هەرچی بکەم هەر مێوانم

دوو زەمەن دوو شوێنی جیاواز

عەشقێکی بە سۆز و دڵێکی پڕ مراز

منی ڕاهاتوو بە ژیانی نیعمەت و ناز

چۆن دەتوانی وەک دەتەوێ

دامبڕێنی لەو ژیانەی پێی ڕاهاتووم، خۆم دەمەوێ

وەک بەفری بەر تیشکی هەتاوێکی بەتین

وەک دڵێکی پڕ لە خۆشەویستی و ئەڤین

هەروەک گیانێ زۆر بەهێزبێ، بەزەحمەت ڕیشەکێش بکرێ

وەک درەختێ ڕەگی لە بنی دەریا بێ هەڵ نەکێشرێ

خوا دەزانێ ئێوەم هێندەی دڵ و گیانی خۆم خۆش دەوێ

بەڵام قەت ناتوانم دابڕێم لەو چارەنووسەی دەمەوێ

---

(*) ساڵی ٢٠٠٠ لە فلیمی چارەنووس گۆرانی بێژ نوری گەرمیانی بە مەقام دەیڵێ .

## سەگوەڕ

خـــوایە دابـــڕزێ دڵـــی، شـــەڕباز و کینـــاوی بەدان
هەڵپەرســـت بەدان! خەریکـــن! چـــاوچنۆک بەپێـــوەدان!

نـــاحەزی حولحـــولی، بەچـــکەی حـــاڵە! گەنـــدەی لەوەڕە!
ئەوەی پـــاگژ بـــێ مەحـــاڵە، بێـــتە ئاســـت ئەم ســـەگوەڕە!

جەرگـــی پارەپـــارە بـــێ کـــێ ژینـــی هەر بـــۆ پـــارە بـــێ
خـــۆ فرۆشـــی پـــوولەکی بەم خـــاکە هەر قەرزارە بـــێ!

قەڵاکەی هەولێـــــــرە مەردە ئـــــــارامی هەیە بەرزە!
گۆینـــــدەی ســـــپڵەش ڕوو زەردە ســـــمەکەرە ! لەم ئەرزە!

ئەوەی ســـاغ بـــێ خـــۆی و پەیقـــی بێشـــک هەر چەوســـاو بـــووە
زڕ هـــونەر! چەنـــد بـــاو بـــێ ڕیســـی پەتـــک !هەر ڕیســـواو بـــووە

شـــاعیر هەنـــد عەشـــقی کچێکـــی قەیـــرەی کـــوردە لات بـــووە
بەم دەردەی شـــێت بـــێ چـــش! ئەویـــش قوربـــانی وڵات بـــووە!

هەولێر شوباتی ٢٠٠١

# مەرگی ناو چەماوەی داخراو



موکــوڕ بــوو بەر لەوەی بمــرێ هــۆنراوێکی وا داڕێــژێ
ئەوەی خەڵکــی نەوێــران یــان بۆیــان نە دەلــوا بیبێــژێ
ئەو گوناحــانەی کە هەرگیــز پــاگژ نــابنەوە بە نــوێژێ!
لێشــاوی حەسرەت و داخــی کــوردی بــێ نەوا هەڵڕێــژێ
دەیویســت بڵــێ :مــن دەمەوێ بــۆنی گــوڵێکی وام بــۆ بــێ
لە کێڵگەی براکــوژان نەڕوێ و بۆیــان نەشــێ و نەیانــدیبێ!
تێهەڵکــەم لــە حەیــرانێــکی دڵڕفێــن کەس نەیچڕیبــێ
سەربەند و دوابەند ولۆی لۆی جودابێ لە پێشینی خۆی

شیعرێکی ساکاری بێگــرێ

چاوساغی گەل بێ و دەستی لێ قەومــاو بگرێ

لەسەرکەشی و چەمووشی کەسیــان نــەپرسێ

لــە بێجێی و گــرژی و مۆنییان نـــــەترسێ!

وشەکانی ئازا و هەق بــن تیــژ بــن وەک خەنجەری دەبــان
لەڕاست ناهەقدا چاوزەق بن ! سەنگەر بن بۆ مافی ئینسان
پەڕو باڵی نەرم و ڕەق بــن! نەچنــە ژێــر ڕکێــفی شەیتـــان!
بێباک بــن لــە تێهەڵــدان و بەندیخانــە و زمــان بــڕیــــن!
لە هــەڕەشەی دەرکــردن و شــەڕی دەروونــی و نانبڕیــن!

حەزی من وایە و دەمەوێ بـۆم هەڵکـەوێ

شۆخێکی نەشمیلە و جوانی وام خۆشبوێ

نـە بـەرق و کینـەی ئـێـرە و نـە هـی ئـەوێ

کـۆیلەو دەسـتـەمۆ نەبـووبێ، هۆشـی لەسـەرخۆ نەچـووبێ

گیـانـی تـەژی مـۆسیـقـا بـێ بـە ناسـازی نـەژەنـدرا بـێ

پاییزەی حەزێکی سەرمەست بێ تەنیا بۆ ئەوین خوڵقا بـێ

هەرخۆشەویستی مەبەست بێ بۆ هیچـی تـر نە سـازا بـێ



دەیویسـت بڵـێ :مـن وام دەوێ چ لێـرانە بـێ چ لـەوێ

لەشـعرێکی بەچێـژ وخـوێ لەگوتـارێکی ڕاسـتگۆی نـوێ

نهێنییەکـــی ســـادە و بایەخـــداری ئەوتـــۆ بـــدرکێنم

بـە سنووری، نـا مـاقـووڵی

خۆکردی نێوان گـوێچکەڵە و سـکۆڵەی دڵـم هــەرەس بێـنم!

ئـەو تخووبـانەی دێگەڵــە و سماقــووڵی ! تێـک بشکێـنـم!

هەر هەرەسە! و هەراسان وبڕ بـڕو لــەت لـەتی کـردووین!

شوورەییەکی تەرەسە! و نووچی قووچە! ئـابڕووی بـردووین!

ئەم (دووانە!)ی بەدبەختیـیە! عەیـامێکە قوڕگییـان گرتـووم!

راپـەڕیـــن و کـــۆڕەوە پـیرۆزەکـەشـیــان زەفــت کــردووم!

ئەو چەمــــاوە داخــــراوەی  دەورەی داوم!

دیــوارەکەی  لە دیــواری بەرلیـــن دەچــێ!

ئەو بیــرۆکە لاتــڕقەوچەی  تێــی ئــاڵاوم!

لە گیاندانی  ناو قۆرتەکەی!  مـردن دەچــێ!

ئەوە مــــنم کـــونە مشــــکم لێکـــراوە  بە قەیســـــەری !

ئەوە مــنم ! لە خــاک و ئــاوو هەوای خــۆم  بــووم بێــبەری!

ئــەوە نیشتمانی مـنــە؟!

یان خاکی برای دوژمنە؟

یان هی جەلالی ومەلایی!

سەربەگۆبەن ! ناتەبایی

دڵپڕ لە کینەی بێ بنـە!

ئــاش وەســتان و شکســتێکی ماڵـوێرانــــە

هەر پیلانگێـــڕی و نـــۆکەری و بێگانــــانە

هەر تێکـدانە ..خـوێنی لەڕێــی هــیچ  ڕژاوە

بەشداربووی هەڵخەڵەتاوە

لەناو گێژاوی نووچدانـە!

تــــــاڵاوی ڕەشی مردنە ! کورد کوشتنـە

عەقلێکی قوندە و سەقەت، بێ سەر و بنە!

## بەشی ٣

### قامچی

بـاپیـرانمان

بەرلەوەی لە دایک بـن و بێنـە ژیـان

باوکیان نیازی بوو بێگومان

منداڵی کۆیلەیان ببێ و بە کۆیلەییش بێنە دووان!

کۆیلەی کۆیلەش !

وەختێ کە منداڵیان دەبوو بێ پشوودان

نەوە دوای نەوە پشتاوپشـت وەچەی نـوێ کـۆیلە دیسـان

دەبوونەوە قامچی دەسـتی دوژمنـی خوێنخـۆری خۆیـان!

دەچوونەوە.. ناو حەڵقەی زیکـری نـۆکەری جـاری جـاران!

سەر دەرنابەم لەم بێ زاخی و بێ دۆنییە!

ئەو بێ سەری و خۆخۆریەم لەسەر چییە؟

دوای قـرتێبـوونی ئـەنفال و ژەهـراوی بـوون و مـردنم!

گـوایە ! لە پـاش دەیـان سـاڵەی خەبـات و شۆڕشـکردنم!

کـوانێ بـۆ مـن بـوونم نیـیە؟

ڕێبـازێکی ڕوونـم نیـیە؟

لەقووتـووی هـیچ عەتارێکـا!

لە مێژووی هیچ پەیامبەر یان زۆردارێکا!

چ بێخوست و شوونم نییە؟

## دەرفەتی دەرچوونم نییە؟

پەندێ لەشەڕگەی خۆکوژی و خێڵبازی وپەرتبوونم نییە؟
تروسکەیەکی ئومێدی چاکبوون و یەکبوونم نییە؟
خوایە گیان دەرمانی دەردی کوردو جاشایەتی چییە؟
چارەی ژەهری منمنۆکێی! کورد و پاشایەتی چییە؟

ئێمەی کۆیلە، بۆ دوژمن بێتام ڕووخاوین
کڕنۆشاوین!
بەسەرسەر دەخشین تادەمرین
هەر ژێر چەپۆک و پێناوین!
لە ئاست یەکتر شێری نەڕین
گێچەڵکەری زۆر بە زەڕین!
عەشقی نرکەی مەترەلۆزی
کوڕی قۆزی
گەرمەی پێکدادان و شەڕین!





دەیویست پێش مەرگی ناوەختی

بـە ژانی گیـانـەڵای سـەخـتی

لەشیعرێکی ڕوون بەرۆکی براکوژی ئەم عەسرە بگری

بە کوڵ بۆماڵوێرانی و بەد بەختی ئەم میللەتە بگری

بگری بۆ زامی سەر دڵی کچ و کوڕی کورد تا دەمری!

ئێوەی فیلەگەورەی کۆیلە

بـە زەنگوڵـە و بـە پلپلـە!

هەرچییەکن وەکو یەکن!

شەڕانگێز و پاشمەرگەنە!

ڕێک دوژمنی جەرگبڕی پێشمەرگەی ڕاستەقینەنە!

گەر ڕاستی ودەوێ بۆ مێژوو

بێ سێو و دوو!

هەم پاشدز و هەم پێشدزن!

دز و درۆزن !

لەناو بازنەیەکی خڕن

کاسەلێس و تەقڵەباز و هەمباندڕن!

لەڕێی پایە و پارە و گیرفان، قەل و شەیتان!

ورگــی فەقیـــر و هـــەژاران هەڵ دەدڕن بـــێ ڕاوەســـتـــان

نـــان و پیـــاز و گۆشـــتی قـــاز و زوڕنـــاژەنیتـــان بـــە قـــورعان

نە بـــۆ گەلە و نە بـــۆ خـــاکی پیـــرۆز و جـــوانی کوردســـتـــان

تەنهــابۆ  زگ و بەرزگتــان خۆشــبێ وەتەن! خۆشــبێ وەتەن
یــاکورد قــڕان یــاخود نەمــان  بەرز بــێ نرخــی دۆلار و یەن
بــڕژێ خــوێنی  پیــر و زارۆک و نەوجەوان  بە عــیلم فـــەن!
ئەی ڕەقیــب خــاتر جەم بە تــۆ !قەومــی کــورد نیــوە مــردووە
تا وا دوژمن بن خۆبــەخــۆ  کوا ئــاڵا ی بـــــەرز و زیندووە؟
ئــێــوە و کوردێــنی و خەبــات و قــوربانی  کوجــامــەرحــەبا
هەنــدێکی دەخــۆن بــێ حەیــا  ئەوەی مــاوە  لە بــن عەبــا!

## بەشی پێنجەم ە

## [illegible]

بڕیاربوو بەرلەوەی بمرێ
لەشیعرێ یەخەیان بگرێ!
وشـــەی تەزرەکــوت وەک کــوچکە بەســـەریان داببـــارێنێ
ڕســـتەی عاشـــق وەک مــۆتەکە خەولە چاویـــان بتـــارێنێ
دۆخینــــی بەرژەوەنــــدی نـــا کــوردێنییـــان بــبــەزێـــنێ!
ئێــوەی زێــدەتــر لــە بــەنــدە
دەهۆڵ دڕاو  گەورەی گەنــدە!
دڵ و دەروونتان پڕ هەڵدێر وخەرەندە
خۆتان هێندە پێ فەیلەسوف و پسپۆڕی بە توانایە
لــە ئــێــوە  بتــرازێ ئیــدی  سەر لــەبــەری نــاڕەوایە
نا دووربین و نا پەسەندە
نابێ سەر دەرکا لەم عەردە!
کێی دڵسۆز و پووڵ نەخۆربێ  موڵکی گشتی ئاو دیونەکا

بۆ گەل وخاکی خەمخۆربێ   ڕۆڵەی خەڵکی هەتیو نەخا
بـە بێبـاکی و بـە خـۆڕایی
وەک گورگی هار نەخواو نەبا
ڕاستەوخۆ یان لابـەلایی!
لەپـــرخەی خەوی قووڵـــدایە فەقیرحـــاڵ و نەگونجـــایە
لە کـــاروانی تێکوشیـــن ! و قـۆرخـــکاری بــــە جێمـایـــە
تەنیاوتەنیـا پـــوول وپـــایە و هەرچـــی ســـەرمایەی دنیـــایە
شایســـتەی ئێـــوەی پـــاوانچی لە بەرهەم بـــردن بـــاڵایە
بەری ڕەنـــج و نەسرەوتنـــی جەنـــابی شـــێخ و ئاغـــایە
بازرگـــانچی! بە خـــوێنی چەوســـاوەی وڵات نـــاقۆڵایە!
هەڵکەوتـــوویی ئەوان لە گێلـــی و دڵســـافی ئـــێمەدایە
چەندچاوچنۆک و خود پەرستن خودایە
پێیان وایـە ڕەزامەندی تۆیشی تیـایە!
دەیویست بەڕاشکاوانە لـە مستیاننێ
ئێـوەی ملیـاردێری ئەمـڕۆ و لاســتیق لە پێکـانی دوێنـێ
ژمـارەی ئـــەو دۆلارانـــە و ســـۆزانییانە و لەکـوێ هێنـا؟
ئەو پـــلانە دۆزەخییـــانەی براکوژیتـــان چـــۆن داهێنـــا؟
بـــەد و نابینـــاو نـــادانن! وەفـــاکوژ و بـــێ پـــەیمانن
بەهـــای مـــرۆڤ و ویژدانـــی بە ئاگـــا هەرگیـــز نـــازانن!



کێشمەکێـــشی دووبەگـــایی و کـــەڵەگایی

ڕمبوهـــۆڕی بەگ لە تەک بەگ، ســـێبەگایی!

وێرانکـــاری و پـــەلاماری مـــەڕی لەڕو دەســـتەوایی
بێـــزەوەر تـــر لە ئاغـــایی و دەمـــاوی ســـەگ! نـــاڕەوایی
ژەهـــری مـــارە ناکەســـبەچە و پیلانگێـــڕی و کەڵەگـــایی
زەرەنـــدێکی ژەقـــن و ژارە، شۆڕشـــگێڕی و بـــێ وەفـــایی
خیانەتبـــازی و دووبەگـــایی ! گیـــرۆدەی کـــاری مافیـــایی
سیاســـەتبازی و ســـێبەگایی ئـــاڵوودەی دەردی مافیـــایی
جەردە و تـــاڵان پەوەرانـــی ئێـــرە و دائیـــم بـــەرەڵڵایی
جەردە و تـــاڵانپەروەرانی ئەولاو هەردەم بـــێ یاســـایی
لەهەرکـــوێ بـــێ دزی و هێـــزی بەربەرەڵای کە لە گـــایی
دڕدۆنـــگە لە گەڵ تەبـــایی و گەلپـــارێزی و وڵاتئـــاوایی
گەندەڵکاریی بێ ڕکابەر
ستەمکاریی ڕادەبەدەر
ناحەزە لە گەڵ ئازادی و خەبات بۆشایی و جودایی
خەیاڵپڵاوە دادپەوەری و یەکسانی وخەونی ئینسانی

## [illegible]

ئــای دەردە کــوردێنی و مەردی ئێــرەم چ ســەخت و دژوارە

تــف لــەو دەمەی پاشــەوپاش و دڵبــەرداش وخــێچ و خــوارە!

ڕوو لە کێ بکەی ڕاســت وچەپ یەکســەر تۆپێنــت پێــدەکەن!

هانا بــۆ کــوێ بــەری خێــرا بــەکونی دەرزیــت دا دەبــەن!

هاوەڵ کۆیلە نقە نقە گەورەکانم!

برادەرە چاو برسییە چەورەکانم

کۆنە هاوڕێی هەژارە چاو بەورەکانم

گوێیان لە دەنگێکی جیاواز لە خۆیان بێ

چاویان لە ڕەنگێکی جیاواز لە خۆیان بێ

هی کــورد و کوردســتــانییــان بێ هــەر زوو کوێــراییــان دادێ!

هی دوژمنی خوێن خۆیان بێ یەکسەر کیفەی سمێریان دێ!

هی بێگانە وداگیرکەری نیشتمان بێ

لە خۆشییاندا باڵ دەگرن

هێنـــدە ملکەچــی دەنوێنـــن هەر لە ســەر ئــاو و ئاگـــرن!

لووتیـــان لە زەوی دەخشــێنن بەڕیــز لە باتییــان دەمـــرن!

لێــرە و لەوێ بە ڕۆژی ڕوون بــێ یــان بـــە تــاریکی شــەوێ

قەت لــە خاوەن کــۆیلەدارە گەورەکانییــان هیچییــان نــاوێ

هەر سەرکاری و پێشخزمەتییان بەرکەوێ! هیچییــان نــاوێ

ئــەوان فێــرن

بۆ گەل و خاک و نیشتمان  هیچیان ناوێ، ڕوو لەخێـرن!

ڕاهاتـوون هەردەم نـا تێـرن! سەرکز و چاو بـەرە ژێـــرن

لەڕاست خەڵکی قوڕبەسەر و ستەمدیدەش، دەڵێی شێرن

لە سای سەری؛ ئاغا"ڕەفیق" یۆڵداش "کۆیلە گەورەکانم

لە تاریکستان داش بە داش! بەلاش نوقمی تـەمتـومـانـم

لەدنیای پوولپەرست فوول کاش مایە پووچ و سەرگەردانم

لە گەڵ خودی خۆم دوژمنـم  بێ ناسنامە و نیشتمـانـم

غەریبتـریـن غەریـب منـم  سەیر و سەمـەرەی جیهانـم!

## بەشی: ٨
## زیندووی مردوو

ئەوکەڵەگا شکستخواردووە دیلانە

هەر ئەو فسۆس پاڵەوانە زەلیلانە

گشت عەشقێکی نوێ و پیرۆزیان لە من قەدەغەکـردووە

گشت جەژنێکی  نوێ و نـەورۆزیان  لێرانـە لەناو بـردووە

وەتـەی بەنـدەی بێ ئیـرادەی  وەکو مـن لـە دایکبـووە

لەوساوە زیندووی مردووە!

چەند عەیامە بەرواری بە کار هردنی  بـە سەر چـووە!

بە ناو چاڵی خەڵوەتێکی  قـووڵی بێبـن دا ڕووچووە

لە گەڵ عیفریـت و دەجـال و جنۆکەدا تێکەوتـووە
تەنیا و تەنیا جێگە هەیە بـۆ پـەرستنی ئەژدیهـا
لە بن دنیاش، ڕێگە هەیە بۆ خۆشویستنی کەڵەگا!

## بەشی: ٩
## [illegible]

جێی خۆی بوو بەر لەوەی بمرێ ژانی دڵـی بێتــە کـوڵێ !
بـە زمانـێکی ڕۆشنـتــر لــە ئـاوی کانــــــی هەڵبقوڵــێ!
گۆی بەر قاشۆی چاپووکتر لە پێشینی خۆی، بیـانئەنگێوێ
نـەخۆ عومـر کـورت بهێنــێ و ڕێـک نەکەوێ بیانکەوێنــێ !

ئە مڕۆکە لە سەر ئە م خاکە
نە زان و گە مژ ە بی چاکـە!
بگرە و بکوژە و تاڵانی چاک بکە و ڕاکە!
با گەل ژێر دەست و برسی بێ
هە میشـە لـە مـەتـرسی بێ
ڕۆژیـێـتی کای کۆن بـە باکـە!
تێـکـە و فڕکـە!
ڕەزو باخـی وڵات بۆ خۆت قرچ و بڕکـە
زەوی وزار و دەغڵ و بێستانشی شڕکـە
گیرفان و بانقی پێ پڕکە
دارو دەستەی دەورو پشتی خۆت پێ مڕکە!

سەرمایەی نازدار پەیداکە

گەل ئا سایشی بۆ چییە؟

ترسی نەبێ و برسی نەبێ خەتەرناکە!

لەولا ڕاکە و لەولا داکـە

پاسەپۆرتێکی جیهانی و

ڕەگەزنـــامەی چەنـــد دەوڵەتێکـــی بیـــانی و

هەنـــدێ کۆمپانیـــاو پـــاپۆڕی بازرگـــانی و

هەندێ ڤێلاو هەندێ قەسرو هەندێ خـانی و

هەندێ دۆست و هەندێ دۆڵەنگێوی گیـانی و

هەبـــێ چـــاکە!هەبێ چـــاکە ; هەبـــێ چـــاکە

هەنـــدێکی بگـــرە و هەنـــدێکی بەرەڵـــڵاکە!

چاکەو چا کە!

تا کەو تا کە!

پاکە و پاکە!

هەبێ چاکە هەبێ چاکە هەبێ چاکە!

## بەشی ١٠
## دەعبای حالۆری

دەبوایە بەر لەوەی بمرێ

دەمامکی گشت کۆنـەوەهمـە پیـرۆزەکانمـان دابگـرێ

هەرچی ڕاستی کوژراو هەیە

لای خەڵکی ئاشکرا بکرێ

هەرچی جوانی نێژراو هەیە

دەریان بێنێ ! لە ژێر کاریگەری جەهلی پیرە سیحرێ!

ئەمڕۆکە لە سەر ئەم خاکە جوان و پاکە

عێل و چەکداری بەرەڵا بۆچی چاکە؟

تا پـارەی مـۆڵ، بـۆ کاکی مەسئول پەیداکا؟ ببـا و ڕاکا؟

یان ئێشکچی و دەرگەوان بێ تا ڕابوێرێ و خەم بەباکا ؟

لەو لاکە! هەر وا وەیلا یە و لاکەلاکە!

لەولاکەی کە، کۆچی شووم وترسناکە!

ئەهـا بەو خـوایە تـاکەی کە لەم گیانـدارانەی بـێ بـاکە

حەیـفە پیـرۆزی ئەم خـاکە وئەم قوربانیـانەی کە پـاکە

نابووت بێت بە؛خوێنڕێژ و دەعبای حـالۆری و

سـیخوڕی ملهـوڕی بە زی و تـۆڕی دزی و

لـەم چەشنـە دێـوە ناپاکـە

لەم سەگسارە دەم بەخوێنەی

لەم بـراکوژ ە دڵ پـڕ کینەی

که لە خراپەکـــاری تاکـــە   تاکـــە و یەکجـــار کەتنناکـــە!
بابەکوشـــتەی گەل وخـــاکە   پـــاکە وخـــزمەت وەتەن ناکـــا!
هەتـــا ئە و هـــا بەرەڵـــڵا بـــێ! مـــردن  بـــۆخۆت تەمەننـــاکە
نەکیـــر و مـــونکیر وەســـتابێ   پێـــو یســـتت بە تەڵقـــین ناکـــا!
پاکە و پاکە !نەبێ چاکە!
تاکە وتاکە! نەبێ چاکە!
نەبێ چاکە نەبێ چاکە

## بەشی ١٧
## هیچ و پووچ و [illegible]

لە سەرە مەرگێ دەیفەرموو ئاخ لەدەست هیچ ئۆف خودایە
ئەم ژینە چەندە بێ فەڕبـوو تـا کەی وابێ  ئـەم دونیایـە ؟
پەککوو پەککوو !هیچ بە دەست هیچ!
بۆش و سەگۆڵ و سمێڵ فش و بن لادین و کارۆدۆڤیـــــچ
هیچ و هیچ جەنگی جیهانی سێیەم و چوارەم لەپای هیچ!
خوایە هیچ هیچی لێنایە  هیچ لە دوای هیچ دوایی نایـە!
پەککوو، هیچ چەند نارەوایە
ئەمە چ حاڵە ؟ چ خوایە؟ سووچی منبوو؟ یان هیچ خوایە!
سەیرە  هیچ  چەند  نارەسەن و نەپرژایە
لافیتەیـەکـی داخـدار و  بێ مـەعنـایـە
لە دەورەی قەڵای هەولێرێ  هەڵواسرایە

فەرتەنەیەکی شاخدار و پڕ بەڵایە
لە شاری شێخی بێ پەنا هەڵکرایە
دروشمێکی قێزەون و واق وڕمایە
لەدەرگەی پەرستگاکاندا هەڵکۆڵدرایە
ئەوە چ حاڵە؟ چ خوایە ؟
ئەو مەینەتی و هیچێتییەی ئێمە لە کوێی زەمەندایە؟
هەرچی لاوە
ئەوەی عەشقی جوانی مانگ و جیلوەی چاوە
کەلێنێکی نا سامناکی بۆ نەماوە
ئەوەی هێشتا بۆ هیچ خوێنی نەڕژێندراوە!
ئازادی بوون و نەبوونی لە دەستداوە
بە فەتوای هیچ
بەداوای بێ بنەمای هیچ
لەگەڵ هیچ دا لێی قەوماوە
لەبەردەم بارەگای هیچ و پووچ و فیشاڵ
دەیەها ساڵ ! وەستێندراوە
بێ ئاگا یان بە زۆر کراوە
بە قوربانی چەکمە و پۆستاڵ
لە شەرگەی هیچ دامەزراوە!
دەروێش ئاسا سوغرەکێش و چەقۆکێش و ماڵ وێرانە
ساڵ دوازدەی مانگ ڕەتێنراوە! بەخوڵیای هیچ!سەرگەردانە
لە ترسی هیچ هیچەکانی ئەم چەرخی دەور و زەمانە

ئـەم کەنـدووە لاپـرەسـەنـگ و کـونـاودەر و بـەتـاڵانــە
ئـەم نـا ساغ و شەڕانـگێــز و ژەهـر ڕێـژ و کاڵفامانـــە
هەر کۆیلەیی و نائومێدیان بـۆ کردوویـن بە دەستمایە
لەم سەحرا و ئەنفالستانـە مەرگچێنـە لـەم ڕێـیـایــە!
بەملکەچی و ڕووت و قووتی ڕایانگرتووین بەبێ سایـە
ئـەوە چ حاڵـە ؟ چ خوایـە؟
ئەم بوونە وەک نەبوون وایە
لە بەر هیچ ! مردن و ژین لە سەرەتاوە
تێکڕای هیچە و خەونێکی هەڵبزوڕکاوە
هیچ لە ڕێی هیچ، پیلانێکی داڕێژراوە
دژی گوڵ و جوانی وئەوین! سازدراوە
داستانێکی پـڕو پـووچی ئـاڵۆز وحـەلـەق مەللەقـە
گـڕکانی کینـەی مرۆڤی شکستخواردووە ئـەحمەقـە!
هەسپە شێیەکی باڵداری! زەبەللاح، خۆشپەڕ، چاوزەقە!
مەتەڵێکی عەنتیکەیـە یـان عیزرائیل یـان لەقلـەقـە!
گێچەڵێکی بێوێنەیـە ! هەو بی و هەو نەبی! بە شەقە!
☆ ☆ ☆
بێ گوناح وا لە گەڵ هیچ دا کەوتووینـە چاڵێ ؛ خودایە!
لە بەردەست هیچ هیچەکانی؛ مردووی مۆدێل وسەرمایە
کەشتییەوانی بە گوڕ ملهوڕ تیرۆرچییانــی ئـەم جیهانـە
بەم دۆزەخەی جۆشیان داوە بۆ ئینسان، کەبەنـاو ژیانە!
هەند کیناوی و خۆ پەسند و بەد و زۆڵن
داگیرکەری بیـر و هۆش وخـاک و خۆڵن
بۆ قازانجی زێدە هیچ عەبداڵ و وێڵن
زەوی و ئاسمانیش دەکێڵن هیچ ناهێڵن

## هێنده بۆشن

هەنـد حەوایـی و ڤایرۆسـاوی و قەڵاچـۆکەری نەخۆشـن
حوکمڕانی بان بـۆرژوا و بـان مـافی ئینسـان ! بەدهۆشـن
شەڕ بەدار و بەردی ئێسـتا و داهـاتووی گەلان دەفرۆشـن
هەمـوو شـتێ لـوول دەدەن و بـێ تێـڕامـان دا دەدۆشـن
هەند هەڵپـەی بـازاڕی ڕەشـی زێـڕی سـپی خۆفرۆشـن
سـەری سـەرجەم کانەکـانی مـۆر دەکـەن و دادەپۆشـن
هیچ ناهێڵن!هێنده تووشن!سرک!ولووشکاوی وچەمووشن
مەغـۆل و تەتەر و ڕۆمـی! دوای عەولەمە و قەرەقووشـن
تـاڵانکەری ئـابڕووبەری بـێ حەوسـەڵە و حەپەلووشـن
هەمـوو شـتێ لـرف دەکەن و بـێ بەزەیـی هەڵدەلووشـن

## هەند جیوەیی و سپڵە و سووکن

لە نـاو تـونێڵی گیـانێکی کێـوی و منجـڕی بچووکـن!
لە ناو گێـژاوی شـەپۆلی حەزی پـووچ وەهمـی چـرووکن!
هـیچ نـاهێڵن چ پەنـا و پـێچ و قـوژبنێ جـێ نـاهێڵن
بەر سـێبەری دار بەڕوویـێ، دارەبەنـێ جـێ نـاهێڵن
(لە بـانی بانیـان هـاوارە یـارم لە بـانی سەربەنـێ
ڕێـی دڵ گیـراوە نـازدارم پەرچەمـی نـاگری لە خەنـێ
جێـی ژوان نەمـاوە دانیشـین پێکـرا بـین بە تـاقی تەنـێ
غەزال عـادزە لاسـە شـۆڕ برینـی کەوتیـتە بـەدەنـێ)

### هیچ ناهێڵن

زەوی و مانگ و ئەستێرە نە دۆزراوەکانیش دەکێڵن

ناهێڵن کەو لە سەر شاخان بقاسپێنێ بە دڵ و بە گیان

دولبەر بە لەنجە بۆت بێنێ شەمامەی جوان لەبێستان

ناهێڵن کۆترە باریکە گمەی بێ لە دەرکی لیسێ!

بەستەی عەشق و دەست لەملانێ سەربەست بچڕێ لە هەیوانێ

### جێژوانێکت بۆ ناهێڵن

دەزگا سازی هەرچی و پەرچی بان ئاغا و سەرداری خێڵن

هیچ ناهێڵن بۆ تەنیایی و مەرگی هێواش جێت دەهێڵن

هیچ ناهێڵن بۆ خۆت جودابی سەردەمێ لە حەیرانێ

حەساوەبی و بە ئاسوودە بژی کەمێ چاولێکنانێ

گەر لە خەونێکی عاجباتی بچیە ئەودیوی زەمانێ

دەنا نابێ هەناسەت بێ لە چ عەرد و چ عاسمانێ!

هەولێر حوزەیرانی٢٠٠١

## کێوی قاف*

وێـــڵ و غەریـــبم دەگەڕێـــم وەک دێـــوانە
لە کـــویێ بیـــت هەر دەتـــدۆزمەوە بەم زووانە

ئەگەر لەکێـــوی قـــافیش بـــی هەر دەتگەمـــێ
ورەم پـــــۆڵایینە و بەهێـــــزە نـــــاچەمێ

خـــــودا فریـــــادڕەس و پەنـــــای هەژارانە
عەشـــق ودووری یـــار پێویســـتی خـــۆر بـــارانە

گەر خـــواکردی، پێـــت شـــادبوومەوە ئەمجـــارە
ڕەنـــگ بـــێ شـــێت بـــم بـــاوکەڕۆ بـــکەم لەم شـــارە

خوایـــــاربێ بێئومێـــــد نـــــابم لەم هەوڵانە
خەون و تێکۆشـــان بنـــاغە و سروشـــتی ژیـــانە

وێـــڵ و غەریـــبم کەوتـــیمە ئەم کێـــوانە
شـــار و دێ بەدوات دەگەڕێـــم وەک دێـــوانە

* لە ٢٠٠٠ گۆرانیبێژ نوری گەرمیانی کردیتیە تایتڵی فلیمی چارەنووس، بەمەقام دەیڵێ.

## ئەسمەرە دڵدارمە*

(ئەسمـــەرە دڵــدارمـــە خـــوێن شـــیرینە یــارمە
لە نــاو شــۆخ و جوانانــدا ئەو مــایەی حەیــاتمە)★

بەهاری ڕەنگـاوڕەنگی ئێسـک سـووک و قەشـەنگی
وەک ئاسکی برینــداری گەزەنگــان بــۆی دەلەنگـی!

بە نـــاز و جـــوولەی هەرزە دڵـــم دێنیـــتە لەرزە
ڕۆژێ یەک جــار دیتنــت وەک نــوێژی بەیــان فەڕزە

بەرزی لە دڵـــما بەرزی جـــوانی لە هەزار تەرزی
وەک مامزی کێو ودەشتی دەڕۆی گیانـــت دەلەرزی

کــاتێ دەڕۆی بــۆ زانکــۆ بەردیــش دەهێنیــتە گــۆ
وەرە دەســـت لەملانــم کە نـــاتوانم بــژیم بــێ تــۆ

کوڵمت بەفری کوێستانە ڕووت وەک مـانگی تابـانە
چیـدی بە نیگـای چـاوت مەمکـوژە توخـوا گیـانە

" ئەسمەرە دڵدارمە "گۆرانی هونەرمەند نوری گەرمیانیە، دوو دێری یەکەمی فلکلۆرە، ساڵی ۲۰۰۰ ئەو دوودێرەی دامێ کەلەناو کەوانەم داناوە، منیش کۆپلەکانی ترم نووسی .

## چۆلەکە

ئەی چـۆلەکە جـوانەکەم   وەرە بـۆ لام گیـانەکەم
هەرگیـز ئـازارت نـادەم   تەنیـا تەماشـات دەکەم

وا دانـم بـۆ هێنـاوی   لەم نـاوە بـۆم دانـاوی
کە تێربـووی لەم سـاوارە   بفـڕە بـۆ ئەم گـوڵزارە

هەرکە گەیشـتیە ئەوێ   بخـوێنە وەکـو کەوێ
شـەوێ بـڕۆوە هـێلانە   کـاتی خەو، پشـوودانە

سـەر لە بەیـانیش داهـات   بەسـتە بڵـێ بـۆ وڵات
من و تـۆو هاوڕێکانمـان   دەیکەیـنە بەزمـی خۆمـان

ئەی چـۆلەکەی ژیـکەلە   خـۆر بێـتە ئەم دەمـکەلە
منیش دەچمە قوتابخانە   جێی خوێنـدن و گەمـانە

٢٠٠٤/٢/١٠

# من قوتابیم

کوردســتانی شــیرینم  جــێگەی بــوون و ئەڤیــنم
ئــاو و هەوات ســازگارە   ئاســمانت و ڕشــەدارە

خۆشەویستی لەلای من   تۆی قیبلەگاو پەنای من
من خاکی خۆم خۆش دەوێ   بە هیوامە سەرکەوێ

خــوایە گیــان بیپــارێزی  پێشــمەرگە و مەتەرێــزی
فێرگەم خــاوێن ڕادەگرم  گــوێ لەمامۆســتام دەگرم

مــن قوتــابیم دەخــوێنم  دیموکراســی دەچێــنم
تاخۆشــیت تییــا ببیــنم  ســەرفراز بــبم لە ژیــنم

لە گۆڤاری هەنگ بڵاوکراوەتەوە     هەولێر    ٢٠٠٤

# تۆپ تۆپێن*

کـوڕگەل زووکەن وەرن ڕاکەن   ئەم تـۆپێنە تەماشـا کەن

ئەی تۆپێنزان بەدڵ وبەگیان  بەرزکەوە ئاڵای کوردسـتان

بەرگــری تیــپمان پــۆڵایە ڕاهێنەرمـــان بە توانـــایە

گۆڵچییەکەمان پاڵەوانـە   تۆپ زەفـت دەکـا لەو ئاسـمانە

کـاپتنمان چـاپووک و ژیـرە زۆر بە ئاگـا و بە تەگبیـرە

وەرزشـــکارانی بــێ کیــنە یاریگــا پێتــان شــیرینە

ئەگەر گولێـک کـرا لێتـان   ورەو نەرمــێ تونـد بــێ پێتـان

هەڵۆ وهەڵمەت پەلاماردەن   گۆلی سەرکەوتن تۆمـار کەن

لە بەرگری و هێرش کردن   سـارد مەبـنەوە ڕۆڵەی مەردن

بـەگیـانـی خۆشەویستی وپـاس

بەدەست دێ گۆل وکاس، سوپاس!

هەولێر نیسان ٢٠٠٤

☆ ئەوشیعرە لە گۆڤاری هەنگی منالان ژمارە ٩٣ بڵاو بۆتەوە.

# سیحری باڵای

دایکردۆتە ڕێـژنــە بـارانـێـکی بـە خـوڕ ســەر بـە کـڵاو
چەندخۆشەخۆم و یارم لە ژێری بین، دوور لە چاوی گڵاو!

خۆم بۆی ببمە چەتری سەری بگەڕێـم بـەنـاو باخـەڵی
دەسـت وەرێنـم لـە کەمـەری ماچ کەم کوڵمی سوورە گوڵی

شەیدای ڕۆحی بووم، شێت دەبم گـەر نەونەمام نەمدوێنێ
چ سیحرێکە دڵکێش دەکات تـا وەک بولبول بۆی بخوێـنـێ

هەرچەند نەخۆش و کەنەفتم حەزدەکەم عەشقەکەم سەرخەم
لـە گەڵ یارێـک گفتم دابـوو ئەو ژینـەی ماومە بـەسـەر بـەم

نـەبوونی باشترە تەنیایی و ژینـی بێ هـاودەم بەبێ ئـەو
کێ هـەیـە گیـانی لێسەنـدرێ و چاوەکانی بچێتە خـەو؟
٢٠٠٥/٢/٢٠

## عەشقی خوایی

سالّی ٢٠٠٥ ئەوشیعرەم لەسەر داوای مامۆستایەکی قوتابخانەکەمان، دەربارەی خواپەرستی نووسی، تەنیا هەر ئەوشیعرە تاقانەیەشم هەیە لەم بابەتە.

برسی دونیا و تۆبەکارم هاتوومە دەرباری باری
پەشۆکاوی ڕۆژی حەشرم دایمە دەکەم گریە و زاری

خوایە لەو بەندەت ببوورە با نەمرێت بە گرفتاری
فەرمووتە دەروازەی تۆبە والایە بۆ خەتاکاری

منی بێ هێز و بێ چارە هاوار دەکەم پڕ بەزاری
خولقێنەرم بگە هانام لە تەنگانە و شەوی تاری

هەر دەم خەیالاتی تۆمە پاشام توانا و کردگاری
لە زیکری تۆ نقووم بوومە لەترسی ڕۆژی بێ یاری

ڕەحمێ بە حالّی بەندەتکە پەشیمانە بە یەکجاری
توواوەتەوە بەو عەشقەی تۆ بەشکەم بێتە هاریکاری

زەرەرمەند و موبتەلا خۆم زۆرم کردووە گوناهباری
دەرگای عەفووت بکەوە بۆم خۆت لێبووردەی تۆبەکاری

کوردێکی سادە و غەریبم دەنالّێنم بە ئازاری
مەگەر هەر خۆت دەرمبێنی لە گومڕایی و دەردەداری

سوێند بەعەشقی خۆشەویستی نووری پاکی خوداکەی خۆم
گەلێک پێویست بە ئاوڕێکی پڕ بەزەیی دەروازەی تۆم

هەولێر نیسان ٢٠٠٥

## بۆ هاوسەرە ئازیزەکەم

هـــاودەمەکەم نەکەی ئــۆغرکەی ناکـــاوی بـــۆ ئەو دونیـــا
عـومری شـەکەت بـووم بـێ قەڵا زەحـمەت بـڕ بکـا بە تەنیـا

لە هەرکـوێ بیـت بەدواتـدا دێـم وەک دێـوەرە بەبـێ وچـان
تـا لە خەیـاڵیش دا نـیمە بـێ تـۆ بـۆ چـرکەیەک ژیـان

ئـەی ئازیزتریـن ئازیـزی دڵـی شـەیدام تـۆم خـۆش دەوێ
گەر بەهەشت بێ تۆ بـێ دۆزەخ خۆشـترە لام دەچـمە ئەوێ

قەت بیـر لەوە نەکەیـتەوە جـێم بێڵـی ئەی گـوڵی سـوورم
چەنـدی لـێم نێزیـک ببـیەوە پـێم وایە هێشـتا لێـت دوورم

"ئایشێ" کەم ئەی هاوسەرەکەی خاتوون و ماندووی خێزانم
مـن بـێ تـۆ بـێ نەوا و هێـزم قوربـان خـۆم بە هـیچ نـازانم

دڵ ڕێی پێم، نادات بێم، بۆ لای باڵات نێم، بـۆم، دەرنەکەوی
شـیعریش خامۆشـە تـا خەنـدەی گـوڵزاری تـۆم بەرنەکەوی

دونیای ڕوونم لێ تاریکە   بێ تیشکی ڕووی گەش و ئاڵت
بەختم ڕەش و دژ و ڕکە   لێم دیار نەبێ چاوی کاڵت

لە چاوانی تۆوە سەیری   جوانی ژن و ڕەوشت دەکەم
بە هەناسەی عەشقی تۆوە   کڕنۆش بۆ خوای سروشت دەبەم

مەرگم بە پێش مەرگت کەوێ   (ئایشێ) ی نازدار و بەوەفا
دەردو بەڵات بەر من کەوێ   لە گەڵ من زۆرت چێشت جەفا

هەولێر ٢٠٠٧/٥/٧

## بۆ هەولێرەکەم

هەولێـــــرەکەم شـــــارە جــــوان و نــــازدارەکەم

دێــــرینترین شـــوێنی خـــاکە پـــڕ خێـــرەکەم

ئەی مەڵبەنــــــدە مەنــــدو ژیــــرو بــــوێرەکەم

شــــــارە هەردەم خـــــۆڕاگر و چــــــاوتێرەکەم

دکتاتۆرەکــــــان بچــــــووکبن یــــــاخۆ گەورە!

ســـــەریان لە ئاســــت قەڵا نزمەو!دەمیـــان چەورە!

هەولێــــر لەمێــــژووی نزیــــك ودووری

ســـــــەری قەڵاتــــــی دانەنەویـــــوە

لەوەتەی هەیە ڕۆڵەی جەســــــــووری

بە ڕووی زۆرداری هەر ڕاپەڕیـــــــوە

بەنـــووکی خـــا مەی (ڕەنجبەر)ەکــانی

مێژووی سەربەرزی بـۆ گەل نووسـیوە

بە خـوێنی گەشــی جـوامێر و جـوانی

زگــــی بـــێ دەنگـــی دنیـــای دڕیـــوە!

هەولێر ٢٠٠٩

## بۆ وەچەی نوێ

ســـــەردەمێکە بەئومێـــــدی هــــاتنی تیشـــکی خـــۆرێکم
تایەکســـــانی بنۆشــــم وەک ئـــــاوی تـــــرێ لە پێکــــێکم

مــــادام ڕووم لە ڕوونـــاکییە تـــاریکی هەر دەبــــێ بــــڕوا
مـــــرۆڤ گەر هــــاتە مەیـــدانێ پێـــداگر بە بیـــر و بــــڕوا

دادگەریـــش دەبــێ بەرپـا بــێ  ئەمســاڵ یـا ســاڵانی دابــێ
دەنــا هەرگیــز بەخـــتەوەری  بەشـــی هــیچ تــاکێکی نــابێ!

ســـەرم قوربـــان ئازادییــــە و دڵ بــۆ ئــاڵای وڵات  دەگــری!
تا وەچەی نـوێ ئـۆخەی بکـا و داری هیـوای گەل بەربگـری!

٢٠١٠/١٠/٦

# گەندەڵی چییە؟

"کۆمێنتێکم بوو بۆ پۆستی هاوڕێیەک لەسەرگەندەڵی"

گەندەڵی هیچ بنی نییە

چاکسازییش قەت پشتی نییە

کوردستانیش سەری نییە

هەژاریش هەر دەستی نییە

دز و جەردەیش هەستی نییە

بازرگانی خوێنی خەڵک، منەتی نییە

زوڕناژەن و دمبگچیش هیچ کلکی نییە

زۆردار و خوێنمژیش بێشک دڵی نییە

مەسینە هەڵگریش هیچ کات

چاو و ڕووی ناو خەڵکی نییە

توندڕەو و تیرۆرچیش هەرگیز دینی نییە

ئەڵقە لە گوێ و چڵکاوخۆر ویژدانی نییە

بەرژەوەندخوازی حیزبیش هەر عەقڵی نییە!

٢٠١٤

## سڵاوی بێ پایان لەژن

سڵاوی بێ پایان لە ژن

هەم هاو ژینن، هەم کیژ و هەم دایک وخوشکن

چرای شەوگاری تاریکن

تەواوکەری نیوە ناچڵەکەی منن

بەرهەمهێنی بونیادی ڕیشەی مرۆڤن

ژنی ژیر و ئازا و مەزن    دژی چەوسانەوە و غەدرن

دژی کاوڵکاری و شەڕن  خاوەن دڵی چەشنی بەفرن

سەرچۆپی جوانی سروشتن   کانیاوی عەشق و هەڵبەستن

ژنی مەزن،  هاوڕێ و پاڵپشتی  پیاوانی  مەرد و بەرزن

پڕ بەهرە و لەبار و تەرزن

گوڵزاری جوانی چوار وەرزن

تێکڕا بڵێن  بەڵێ  بۆ ئازادی ژنان

هەوێنن بۆ شارستانی وشادی ژیان

هەشتی مارس ٢٠١٥

# کۆبانی تۆ شه ڕەفی نیشتما نی



مـن نەمدەویسـت بەم تەمەنەم قەتماغەکـان هەڵـدەمەوە!
لەم زەمـــانەم ! دەرگەی زام و ئازارەکـــان بـــکە مەوە!
بەڵام چ بکەم؟ بێ دەستی خۆم دوای بەرخودانی کۆبـانی
هەسـتم بـزوا و پێنووسـەکەم هێنـامیە گـۆ بە ئاسـانی
لە کوێندەرێ دەست پێ بکەم ؟
دەست بۆ کام زامی قوول ببەم ؟
لە کارەساتی شەنگاڵ و برینە پڕ خوێیەکانی
لە زوممار ولە مەخموورو زامە کۆن ونوێیەکانی
برینە دایم کراوە و هەرگیز سارێژ نەبووەکانی
ئەنفال یەک و.... ئەنفال هەشت و
ئەنفال نۆ و ! دەی ! بادینانی ! ؟
هێشـتا فرمێسـکی خـوێنینی کیژانـی وڵات نەسـڕابووەوە
قیژە و نرکەی سەردولکەی ئەم کۆستە مەزنەم نەبڕابووەوە
زامـــی کۆبـــانی و ڕۆژئـــاوا بە ڕوومانـــدا کـــرایەوە
قەپاغی مێژووی پڕ لەسوێ و پـــڕ نەگبەتی هەڵدایـــەوە
ئاش وەستانی بە قورمیشی پڕ شووڕەیی و ....!؟

موفاوەزەی ژێـــر چەپۆکی و بێ شکۆیی و ....!؟
دەردی براکــوژی و خۆخــۆری کــۆنی بە بیــر هێنــاینەوە
خــۆڕا گــرییەکەی کۆبــانی دەرســێکی نــوێی دا دا یــنەوە
دوای شکســتی بەردەوام هــات ئومێــدی بــۆ گێــڕاینەوە
داســتانی ســەنگەری عەشــق و بەرگــری بــۆ نووســینەوە
تۆڵەی ئابڕووی تکێندراوی غەدری دوێنێی سـەندینەوە!

بەشی ٩

هێشتــــاکە پـاکیــزەکانــی ئێــزیدیــیە مـەردەکانــی
پاشماوەی موغ و پیرانی ؛ خوادای چاکی زەردەشتیانی
غـــەدر لێکراوی شەنگاڵی
ژێر پێ و، ڕننــۆکی سمکۆڵی
چەپەڵە نەگریسەکانی جاحش! ڕزگاریان نەبوو بوو
لە ژێر باری برینە پــڕ شوورەییەکە، دەر نەچوو بوو
ژانی جەلەولاو سەعدیە و زۆری دیکە
لە ناخمان دانەسەکنابوو نەبڕابووەوە
هێشتا پایتەخت
لە چاو قوچانێکی ناوەخت
واق وڕمابوو!
سامی هەڵێهات و ڕاکە ڕاکە باش بەری نەدا بوو!
لە نێوان بەرگری و خۆ بە دەستەوەدان تێدا مابوو

تا شێـرە کیـژ و کوڕانی  شەڕڤانـــەکانی کۆبـانی

بە ئیـرادە و ورەی بەرزی  بە باوەڕی جوامێـــرانی

دەرسێکیان دایە دوژمنان

دیسان کوردیان هێنایەوە   بـۆ بـەرچاو و دڵی گەلان

خۆشەویستی نیشتمانیان  کردەوە وێردی سەر زمان

وەک داستان و حیکایەتی  کـۆن و نوێی بـەر ئاگردان

بوون بە خاڵی پڕشنگداری  مێژووی خۆڕاگری کوردان



هەر وەک ئەفسانەی دیرۆکی  کوڕان هاتوونـە مەیدانێ

وای لە بەر دەست و مەچەکی   کیژان کاتی بەرخودانێ

ئەم قوربانییە و ئەم بەرگرییە بێوێنەیە

لە بەردەم زوومی کامیرای مرۆڤایەتییە

هەر وا سانا و بە خۆڕایی لە مـرۆژە تۆمار نەکـراوە

ئەوەی ئەمڕۆ لەوێندەرێ   ڕوودەدات و ڕوویان داوە

باوەڕ پاکی و خۆنەویستی و دڵسۆزی خاکی  پێوەیە

ئـەوە مـۆری بـەرز ڕەوشتی   میـر خاسانی  ڕۆژاوایـە

دەڵێی مێژووی نوێ و خاوێنی   نەتەوەیەکی دیکەیە!

## بەشی ٣

ئەز قوربانی

تفەنگی ژەنگاوی شانی

کیژە شەنگ و شۆخە شەڕڤانەکانیان بم

کوڕە لاوی عەشقی ئازادی و شەهید و زیندووەکانیان بم

مادام بە جەستەش لەویّ نین با بە دڵ قوربان ئەویّ بین!

ئێمەش ئێوەش، ناونیشانمان هەرچییەک بیّ و لەهەرکویّ بین

ئاخر ئەوان نرخیان گەڕاندۆتەوە بۆ قوربانی دان

ئەوان مەدالیای شەرەفیان پێشکەش کردەوە نیشتمان

بەڵیّ ئەوان لە کۆبانی مێژویان نووسیەوە مێژوو

مێژووی گەلێکی لە بیر چوو مێژووی خەباتێکی زیندوو

نەک لاپەڕەی پڕ فیشاڵ و درۆی زل و پێدا هەڵدان

نەک خۆسەپاندن و غەدر و خیانەت و دزی و تالآن

ئای شەهیدە بێنازەکان

بینیتان چۆن بەرخودانڤان

ئێوەی فەرامۆش کراویشیان هێناوە یادی نەتەوە

جیای کردنەوە لە جاشولکە و خیانەتچی نەوە دوای نەوە

ئیتر لە دوای کۆبانیّ گشت بە ناو سەرکردە و بنکردە

خاوەن چەندین مەتەلۆکەی هەڵبەستراو، ساختە سەربوردە

مەسئوولی خێڵ و بنە ماڵە فەرمانڕەوای دز، نامەسئوول

شەیدایانی هەوەسبازی و ناوبانگ و قۆرخکاری و پوول

نۆکەری بێزراو لە خاک و میللەت بە دوور

دزی بودجە و نەوت و گومرگی بێ سنوور

دەبــێ زوو کەن تــف کەنەوە ! ئەوەی پێشــتر بردویــانە

لە ژێــر زەمینــی ئێرەیــە؟ یــان بــۆ دەرێ ناردوویــانە؟

هەتا زووە! هەرچی زەوی و ڤێللاو پــارەی گەلتــان لایە!

بڕشێنــەوە! بیگێڕنــەوە بــۆ گەلــی خــاوەن سەرمــایــە

ئەگینــا بــەر لــەعنــەتی مێــژوو دەکــەون

ئەمڕۆسبەی، یەک بەدوای یەکدا دەکەون



نەوەکانی دوای کۆبانی نمەک حەرام بــن گەر بێلن

ئەم قۆنتەراتچییە چاو برسی و بەزیوانە

سامانی گەل، ڕەنجی باو وباپیرانتــان، هەڵ بلووشن

لێ مەگەڕێن، ئەم بیر پووچە ڕزیوانە

ئەم کەترە دێوە، دزێوانە!

بەرهەمی ڕەنجی ئەم خاکە دابدۆشن

شەمەندەفەری نیشتمانتان وەرگەڕێنن

بۆ ویستی چەپەڵ و ناحەز بتانڕەتێنن

نا مەهێلن

مەهـــێڵن پێکـــی بێبـــاکی ڕەزی کوردســـتان بنۆشـــن

دەبا بەس بی چیتر دەرسی حیز بی و میز بی

ئەڵقە لە گوێ و چاو بەرەژێر گوێ لە مز بـی!

بـــۆ ئەنـــدام و کـــادرە مردۆخەکانتـــان مەخـــوێننەوە

چیـتر دەرســـی شـانازی بە قوتابییەکانتـان مەڵێـنەوە

تازە ئیدی بەرژەوەندی چرووکی حیز بی

حیز بی حیز بی !

پوولێکی قەڵپ ناهێنی دوای کۆبانێ

دەبا بەس بی، با چیدیکە کوردایەتی

بـە ئاقـاری بازرگانی گیرفان ویستی

نــــــەبەیـنـەوە!

دەبا مافی پاشماوەی لێ قەوماوەکان بدەینـەوە

بـــا چیـــدیکە لە ژێـــر دروشـــمی پەڕۆدا

کفـن بـۆ ڕۆڵەی بـێ نـازی گەلمـان نەدڕیـن!

تـــا چیـــدیکە لە ژێـــر ســـێبەری درۆ دا!

هـیچ وخـۆ ڕا! بـۆمەرگی گەل هەڵـنەپەڕین!



لـە كۆبانی تێکۆشینـە  شکستیـان بـە شکسـت هێنـا

لە باشووریش تێگوشینە ! جەرگی گەل پڕی لە خوێنە!

دڵی منیش تەژی برینە

قوربان دایکی، جەرگ سوتاوی، شەهیدانی کۆبانینە

ئاخ ڕۆژئاڤا ئۆف کۆبانی   پڕ مایەی حورمەت و ڕێزی

بونیادی بوونم قوربانی   وڵات پـارێـزی مەتەرێـزی

کیژ و کوڕانی مشتەنوور

کە گڕیان بەردایتە گیانی

دڕنـــدە تونـــدڕەوەکانی داعشـــی بیـــر کـــوێر لە خـــوا دوور

خوڵیای وەهمی بەهەشتی پڕ میوەو مەزەی شەڕاب وحوور

کیژە شەڕڤان ....

نارین و ڕەیحانە و جەیلان

بوون بە مەشخەڵ و ئاگردان

چوونە ژوان ودەست لە ملانێی

خاکی دایکی جگەرسووتاوی نیشتمان

لە مەیدانی خۆڕاگری و ڕەوشت بەرزی

دڕیـان داوە بـــە تاریـــکی و گـــزی و نـــاهـــەمـــواری  بـــاشـــوور!

بوون بەتریفەی مانگە شەوی ڕێی ئەنگوستە چاوی بێ نوور

تەنیایی کۆبانی

گریاندی تاساندی بزواندی،

کوردانی، خەڵکانی هەندەران

هەژانـــــدی ویژدانـــــی ســـــڕکراوی مێـــــژووی ژان

غەدری ســـــایکس بیکـــــۆ و پیلانـــــی دوژمنـــــان

لە قەنـدیل تـا کـانی کـوردە سـڵاوی وەفـا و بەرخـودان

لە کوردسـتانیان بـێ هەمـوان چ لە نزیـک بـن چ لە دوور

لـە بـاشوور تـاکو ڕۆژئـاوا لـە ڕۆژ هەڵات تـاکو بـاکوور

هەلە بشکێنن تەڵیسمی هەرچـی پێـی دەگـوترێ سـنوور!

بەش: ٦

دوای کـۆبـانێ و بـەرخـودانی خـۆڕاگـری و کۆڵنـەدانـی

کۆنە بازرگانچی خوێن گشت سیاسەتوانانی گوێ لەمشت!

کەون و نوێیەکانیش هەموو!

بچنەوە بـۆ نێـو گەلانی! دۆخی متـبـووی پشتی مێـژوو!

نەوەیـەکی ئـازای دیکـە

پۆلێ سەرکردەی پاگژی نەبـەردیکـە

بە هەلهەلەی قرمەی گوللەی

کـچ و کـوڕانی شـەڕڤانی کۆبـانی لـە دایـک ببـنەوە!

حیزبچێتـی و جەردەگەری بنبـڕبکەن بیـر بچـنەوە!

نـاعەدالەتی و مەینەتـی ڕیشـەکێش کەن، بسـڕنەوە!

بـە کۆبـانی هەمـوو دونیـا کـوردی ناسـی

شایسـتەی شـانازیمانی جێـی سوپاسـی

لەمە بە دوا کەس شـــــەرمی بە

کـوردێنی بـوونی خـۆی نەبـێ!

وا خـــۆر لە کۆبـــانی هەڵـــدێ

نەتەوەیەکـی لە بیرکـــراو ! بـــەرەو ئاسـۆ هەنگـاو دەنــێ

جلی شەڕڤانان لە بەر کەن

بۆ زەماوەند خۆتان ڕێک خەن

لەبەر گەنـدەڵچی و تـاڵانچی و پـیلانگەران!چـۆک دامەدەن

بە زمانی لووسـی بەر پرسـی نـا بـەرپـرس بـڕوا مەکەن !

شەڕڤـان بـە بـیروبـاوەڕە خـاکـپـارێـزە بـێ وێـنـەیـە

ڕاست و دروست، پڕ بە پێستی پێشـمەرگەی ڕاسـتەقینەیە

سـەرکردەی قوربانـیـدەرە گیڤـارای ئەو سەردەمـەیـە

لە ئـازاری میللەتەکــــەی بە خەبەرە، نەک گـەمـەیــــە!

نە وەک چەشنی لای خۆمان بێ

خەمی کورسی وپوولی قەڵپی ئـاودیوی ئەو دیـو تـاڵان بـێ!

هەردالّدە دەری ئەنفالّچی وخێڵ پەروەری بـێ ئەمـان بـێ !

نەخشەسازی مل بادان بێ بـرا کوژێـکی بـێ پـەیمان بـێ

ئەڵقە لە گوێی شاو سوڵتانی تورکیای عوسمانی وئێران بێ!

هەر وەک حاجی قادری کۆیی دەفەرموێ

لەحەسرەتی خۆ خۆری کوردان وا دەدوێ:

(لە بەر حیزە بەخۆیی  و ناتەبایی

لە ژێر حیزی حیزان  بووینەتە دۆشەک!

هەتا وەک ئاگری  بن کان  لەگەڵ  یەک

ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان  بە پووشەک!)

ستەم دیدە خێر نەدیوەکان هۆ کوردی لات

بەسیەتی بەس

بۆ گۆڕانکاری بنەڕەتی نێو خۆی وڵات

ببنە یەک دەس★

با هاواری مـن و حـاجی  لـە گوێتـان بزرینگێتـەوە

ئەوەی لەڕێی ڕاست لای داوە  بۆ بڕیاری گەل بێتەوە

دڵنیـابـن، دەنـا هەرگیـز  مێـژوو ڕەحمتـان  پێ ناکا

بەڕیسوایی و بـە بەدناوی  نـاوتان دەبا هەتا هەتا!

هەولێر  ٢٠١٤/١٠/٢٧

★دەس: دەست

چلەمین ڕۆژی بەرخودانی کۆبانی

## هەڵاتن

کـــوڕە مەســـئولی لمـــووز حەوایـــی
خـــۆ فشـــکەرەوەی کـــڵاش ســـۆلانی

بـــۆنی نەوت لێیـــدا !خـــۆی بـــۆ نەگیـــرا
پاشەوپاش هەڵات یەکڕاست قوجـانی!

٢٠١٤

## مەشکە لە دار!

دەڵـێن ئەم حکـومەتەی ئـێمە بەردەوام مەشـکە لە دارە
لە ڕاستیشدا ئەو مەشکەیە بێ سێپێکەو هەر لە خـوارە!

ئەو کـــاتەش لە دارە، کەرە و دۆیەکەی بـــۆ حوکمـــــدارە!
نەک بۆ کەسوکاری ئەنفـال، ڕۆڵەی بـێ پشـت و هەژارە!

٢٠١٥/٢/٢٣

## بۆ یادی ڕاپەڕینی هەولێرەکەم

بیست و چوار ساڵی بەر لە ئێستا بوو
هەولێر، ڕاپەڕی دونیا هەستا بوو
شارەکەی حەیران هێشتاش غەمبارە
دایکی شەهیدان دڵیان زامدارە
پێشان بە دەستی فاشستی بەعسی
ئێستاش گەندەڵچی و چاوبرسی کورسی
هەندێ بۆ پلە و پوول و دەسەڵات
لێ یان گۆڕاوە ئازادی و خەبات
چڵکاوخۆر هەڵباز ئەمڕۆ لە باون
دڵسۆزی وڵات گشت بە جێ ماون
لە یازدەی ئازار هەولێر ڕاپەڕی
ڕەنجبەر بوو ناوکی نۆبەرەی بڕی
کەچی ئێستا کە دیار نی یە ناوی
ئامانجەکانی خوراون بە خاوی!
بۆیە خەڵکی شار وا دڵی تەنگە
سەرباری داعش، گەندەڵی جەنگە!
نە ئازادی هات نە دادپەروەری
خەونی شەهیدان وەک گوڵ هەڵوەری!
کاسە کە پڕ بوو بێشک لێی دەڕژێ
چی نەخوازراوە دەشێ بقەومێ؟

هەولێر ٢٠١٥/٣/١١

# تا کەی شوکر بین؟

شـوکر خـۆ شـوکرانە دەدرێ  لەجیـاتی جەژنـانە و مـووچە
کێـی نـاڕازی بـێ نـاحەزە  لێکـدانەوەی چەوت و پـووچە!
دەبـێ  شـوکرانە  بژێربـن  چـون ئاسـایش  بەرقەرارە!
باسـی گۆڕانکـاریش نەکەن! ئەهـا! داعـش سـەری دیـارە!
خـۆ کارەبـاش جارجـارە دێ  گەرمـاکە ناتـان برژێنـێ!
وەزیـری بـا! بەخێری خـۆی  گاز بۆ هەندێ و یستگان دێنـێ!
داخکرای شەڕ و نەدار بـۆچی  سوپاس گـوزار بـن بەم حـاڵە؟
بـەئاگر بەسـتی درۆییـنەی  براکـوژییەکەی چەنـدین سـاڵە؟
خواهەڵنـاگرێ حەکـیمانە ئەم خەڵـکە دەچەوسـێننەوە!
قەیـران سـواری قەیـرانەو وەک  ڕێگـر گەل دەڕووتێنـنەوە!
لە بەر بەرژەوەنـدی کەسـی و مانەوەتـان لە سـەر کورسـی!
ڕۆڵەی ئەم کوردسـتانە و گشـت خسـتۆتە بەردەم مەترسـی!
بەسـە هەتـاکەی شـوکربین  لەئاسـت بـێ ویژدانـی حیزبـی؟
وەچەی خێڵ و ماڵباتی شێخ  پیادەی غەدر و سواری فیزبی؟
گەنـدەڵچی ئێـرە بـێ بـاکن  گاڵتەیـان دێ بە چاکسـازی!
حوکمەتـۆکەی بـنکە تەسـکیش! بەهاوڵاتیـان دەکـا وازی!
دەرچـووی زانکـۆ  کیـژ و کـوڕی  خەڵکـی شـپرزە و بـێ کـارە
بەچکەی بەرپرسیش لێی دەڕژێ   مەسـتـی شـەڕاب و دۆلارە!
بیسـت وچوارسـاڵی تەواوە  بە تەمـای چـاوێکی سـاغین!
کەچی وەک فسـفس پـاڵەوان  لەگـژ یەکـدان، جەردە و یـاغین!

خــوایە کەی داری ئــازادی  کــوردی بــێ دەوڵەت بەر دەگــرێ؟
بازرگانچی سیاسی فشۆڵ  بەس بی! یەخەی میللەت نەگرێ؟
ئەم  هەرێـــمە لنگـــاو قـــووچەی ! لەم چڵپـــاوە وەردراوە!
گەر مــوعجیزەی یەکبــوون  دەنــا دەر بــاز نــابێ لەم گێــژاوە!
مێـــژوو لەم ڕۆژگـــارە شـــوومەش  بێگومـــان دەپێچێـــتەوە!
تفـــی زەمـــانەش بەڕووی نـــا پاکـــان هەڵ دەگەڕێـــتەوە!

هەولێر ٤ / ٧ / ٢٠١٥

## بۆ هەڵەبجەی بریندار

**هۆنراوە /١**

هەڵەبجەی خنکێنراو بە گازی سیانیی
شارەکەی سووتێنراو بەکینەی شۆڤێنیی
من یەکجار بە تاسەم عەوداڵم بێمە لات
نازانم بەپێ بێم یان بەسەر، بەڵێن بێ بە وڵات
ڕەشێنەی گلێنەی چاوانم بە دیاری دەهێنم
هەرچەندە کز بووەو وا بە حاڵ دەبینم
گیانەکەم هەند ئەشکی خوێنینم لە ڕێتا ڕشتووە
ڕۆحەکەم نەخۆشە بۆنی سێوی ژەهراوی کردووە
بێدەستی خۆم دڵی پڕ خوێناوی منیشی ئەنگاوتووە
وا دەیەوێ خەمی تەنیاییەکەت لەگەڵ دابەش بکا
دەبا زۆرەکەی بۆ من بێ، لە ڕاهی خوا
ئەویکەی بۆ مێژوو، بۆ ئاسمان، بۆ هەوا
چیدی تۆ بەرگەی ئەم ئازارەت ناگریت بە تەنها
بەدیار یادگاری ئازیزانت سەرت پاک پاک سپی بوو
نووزەشت لێبڕاوە تووشت بە زەهایمەری پیری بوو
هەندە بە داخی چاوەڕوانی یارانت
سەردولکەی بچڕی بۆ قژی نازدارانت
بازن و خەناوکە و گوارەی گوێی کیژۆڵە خنجیلەکانت
دەسرازەی لانک و شەقشەقەی منداڵانت

بەخەیاڵی خنکێنراوان، زامەکەت وا هاڵاو دێنێ
هەروا باڵا دەکات و لێت ڕادەمێنێ
ژانی بە سوێ لە دڵیەتی بڵێسەی نێڵە نێڵیەتی
شارەزوور تینووە ، گەرووی پڕ خەردەل و سیانیدە
بەداخم بۆ کانی ئاشقانت بێ گوناح ئەمڕۆکە شەهیدە
عەبدوڵا گۆران تاساوە هۆنراوەی ناسکی بۆ ناچڕێ
ناڵیش وا عادزە بۆی ناکرێ
گوێ لە ناڵەناڵ و گریانی حەبیبەی یاری بگرێ
مەولەویش قوڕگی نووساوە سیاچەمانەی بۆ ناوترێ
منیش هەرچەندی هەوڵەدەم
قەسیدەیەکی شایستەی بەم کۆستەم بۆ ناهۆندرێ
شایەنی ناوی هەڵەبجە و زامی پێنج هەزار شەهیدبێ

لەباخی وشەمدا زۆر گەڕام
وشەکان هیچ کامیان نەدەلوان، بۆت بشێ
پڕ پێستی ڕووداوی لەم چەشنەی خۆت بشێ
هەڵەبجەی بریندار
ڕەتێنرای دەست غەدار
دەمەوێ بەدڵ بێم سەرێکت لێ بدەم، نەک جەستە
من هەر دێم شێتی دیدەنیتم، گیانی تۆم مەبەستە
دەمەوێ بە ڕۆح بێم نەک بە پێ، جا لەوێ
پێشکەش کەم بەڕۆحت، ڕۆحم لەم هەڵبەستە!

پێنج هەزار وشەی گوڵ پەپوولەی باڵ نەخشین

بدەم لە بەرۆکی دایکی پشت کۆماوی چاو بێ تین

هەڵەبجەی زویرکراو بە شەڕی برایەکان!

شارەکەی جەزرەبەدراو بەدەست لایەنەکان!

من هەردێم، ئەمڕۆ بێ یا سبەی دەستەکانت ماچ دەکەم

ئەوەی کە قەدری تۆی نەگرتووە بێ شک بەپەندی دەبەم!

هەولێر ٢٠١٥/٣/١٦

## سروودی " سەدای نەورۆز"

"ئەم سرووده پێشکەش بەو پێشمەرگەوشەڕڤانانەبێ کە لەشەڕی داعش دا بەرگریان لە خەڵک کرد"

ئەمڕۆژی نەورۆزی کورده ساڵێکی نوێیە هاتەوه
سەدای سروودی نەورۆز دێ جەژنەمان بیر دەخاتەوه

ڕەنگی سوور بە جوانی دیاره شەبەقی شەوق دەداتەوه
ئەم شەڕە نەگریسە لاچێ کە هاتتە سەر وڵاتەوه

جەژنی نەورۆز و بەهاری ئەمجاره هات بە غەمگینی
با ئەم میللەتە ڕزگارکەین دەری کەین لە ماتەمینی

ئاوەدان بێ کوردستانمان ئاشتی ئاوڕی لێ بداتەوه
شەلاڵی خوێن نەبێ چیتر برینەکەی دەم نەکاتەوه

چۆن ئاهەنگ بگێڕین کە گەل غەمبار و ڕووی لە کزی بێ؟
نا بەرپرسییش بێ پەروا هەر خەریک جەردەیی و دزی بێ !

ڕۆڵەکانمـــان وا لە ســـەنگەردانە گیانیـــان، بەخـــت دەکەن
بە نەبەردی وا شـــەڕێکی ســـەپێندراوی ســـەخت دەکەن

بازرگـــانێکی کەم و کـــورت داهـــاتی گەل، خـــۆڕا دەبەن
ملیارەهـا دۆلاریـان بەش ناکـات هێشـتاش هەر دادەکەن

تـا دێ گەل عـادز تـر دەبـێ چـارەنووس لێـڵ و نـاڕوونە
سەبری ئەم خەڵکە چەوساوە و مەزڵوومەش لەتەواو بوونە!

ئەو گەلەی لە نەورۆز ئەژدیهای لەناو بـرد، ئـاگری هەڵکرد
لاوانـی بە جەرگـی بـۆ چەتەی سـەرکوتچی، نـابن بەپـرد!

ئەمـــڕۆژی نەورۆزی کـــوردە ســـاڵێکی نـــوێیە هـــاتەوە
ســـەدای سروودی نەورۆز دێ جەژنەمـان بیـر دەخـاتەوە

شەبەقی :بەرەبەیانێکی زوو

هەولێر ٢٠١٥/٣/٢١

## میدیای حیزبی

لەبەر فیتـــنە و فیشـــاڵی نێـــوە خۆمـــان
هەراســـان و پەشـــۆکاوم، بەســـتە زمـــان
کەوتـــوونەتە وێـــزەی گەلێکـــی مەزڵـــووم
پیلانگێـڕی فـوول ئـێچ دی وان، ڕووبەڕووم!
میـدیای حیزبـی خـوڵامی بەرژەوەنـدی
فـــوو دەکـــاتن بە ژیلەمـــۆی براکـــوژی
ئەی بـــێ دەوڵەت دەورە دراوی بە ئەغیـــار
یەکبن لە سەرچی بەشـەڕدێن ؟هەی لاسـار!
ناچـار منی پـیـر و کـەنـەفـت و بـێ هـێـز
هـاتوومە گـۆ تـاکەی لە گەل نـا گـرن ڕێـز؟
نەکەن یەکـدی بکـوژن بە فیتـی دوژمـن
ڕۆژگـارێکی سـەختە گـوێ بگـرن لە مـن
بە دیـقەت بـن خـۆ دوور بگـرن لە پـیلان
گێـڕی حیزبـی وەرگێـڕن بـۆ کـۆڵنەدان
ئەوەی میلـی تفەنـگ لێـک ڕادەکێشـن
دەبـێ مەرگـی موفاجـاتێ بکێشـن!
بـپەڕنەوە, بـۆ فیکـری سـەربەخۆیی
وەلابنـێن خـۆ خـۆری و گەلەکـۆیی
لەڕێـی کەس و پـوولی گـڵاو قەت نەکەن
زوڕنـاژەنی و شـەڕانگێزی ئەنجامـدەن
لا یەنگیـری کەنـاڵی فیتـنە مەبـن
هەر بـۆ ئاشـتی هەنگـاو بنـێن تـا هەبـن

هەولێر ٢٠١٥/٥/٢٥

## کۆچ مەکە هۆ کەسی دایە*

* کـزەی جەرگـی دایە نەڕوی توخـوا نەڕۆی
دایە و بـابە جـێ نـەهێڵی بـە تەنیـایی
دڵـم بە کەس نـاکرێتەوە هەر تەنیـا تـۆی
پـێم دەبـەخشی ئـارامی ژیـن دڵنیـایی
کەسـی دایەی، ڕاسـتە کە جەزرەبە دراوی
تووشـی نەهـامەتی زۆر بـووی تۆرێنـدراوی
دەزانـم کە بـێ ئومێدیـان کـردووی بـەڵام
لێـرە بـژی بـە کڵـۆڵی باشتـرە لام
لـە ژینـی ئـەولای غەریبـی و ئـاوارەیی
چارەنووسـی هـات و نەهـات، بـێ چـارەیی
* دایە ئێـرە لە خەم زیـاتر چیـتری لـێ هەڵنـاکرێ
هەر بـێ هیـوایی چانـدنە خـۆ سـەپاندنە لـێمگەڕێ
لێمگـەڕێ بـا ڕزگارم بـێ لـەم بچمانـە قورتـارم بـێ!
سەری خۆم هەڵگرم و بڕۆم لەدەست حوکمی بەرەڵلایی
سیاسی فشـۆڵ داهێـنەری گەنـدەڵبازی و کەڵەگـایی
* ئـازیزەکەم دەترسـم کە لە ڕێگـایێ
تووشت بێ بە قاچاخچی و چەتەی دنیـایێ
بـە بەلەمی کـۆن نوقمت کـەن لـە دەریـایێ
قرش هێرشت بۆ بێنێ بـکەویە حەلا وەلایـێ

دڵــی بــابەی جەرگــی دایــێ   کەســت نە گــاتە هانــا یــێ
ڕۆڵەکەی خـــــۆم نەکەی بـــڕۆی   ئەم وڵاتە جـــێ بهێڵـــــی
بـــا عەرەب وعەجــــەم ورۆم   ئەوخـــاکە جــوانەت نەکێڵـــی

*دایە گیان مـن چـیم هەیە لەم خـاك و عەردە
دەســــەڵاتی نـاچـیــز دڵـــی وەک و بـــەردە
دەزانــم کــۆچ  هەڵاتنـــە لـــە دەســت جەردە
هەنـد خـۆ ویسـت و بەدفەڕو خـۆ بەزل زانـن
هەر بە شــێوە مــرۆڤن خەڵکــی کوردســتانن
* نا.نـا نەڕۆی کـۆچ نەکەی هـۆ کەسـی دایە
نیشـــتمان پێویســـتی بە ڕۆڵەی وەک تــۆیە
بـازرگانچـیـیــە بــێ  ویـژدانـەکــان ڕامــاڵێ
نەك دڵی مافیا ودزخۆشکات، وڵات جێ بێڵێ!
گەنجی ئێرە و هەنـدەران بـێن  بە بیـری نـوێ
ئەم وڵاتە بنیــات بنـێـــن، وان لە هەر کــوێ؟
بـــە یەکبوونتـــان نــاعەدالەتی لە نـــاو بــەن
خــۆ ڕێکخـــەن ڕاپەڕینێــکی تــر بـەرپاکــەن
دەی تەکاندەن، تووڕ هەڵدەن حیزبی بۆگەنی!
ئەو کارگەیەی، خەڵکی کۆیلە  بەرهەم دێنـی !

هەولێر ٢٠١٥/٧/١٠

★ مامۆستا عبدالخالق بەرزنجی وەریگڕاوە بۆ عەرەبی

# کیمیابارانی بالیسان و شێخ وەسان

"هەستی بەرکەوتووەکی چارەسەرنەکراو"

ئەمڕۆ ناوم گوندێکی ژەهراویکراوە.. شێخ وەسانە
ناوم غەدرێکی گەورەیە شارە دێکەی بالیسانە!
سییەکانم لە کار کەوتوون چاوەکانم نابینانە
وەک ئەوەی ئەم کوردستانە ئێستاش ژێردەستی بەعسیانە!
کوردی بەرکەوتوو یا دەمرێ یان بێچارە و دەستوەسانە
ناوی من عەولا و زارێ یە! پەیامێکی توندم پێ یە
یان وەرن چارەسەرمان کەن یان لە وڵاتەکە دەرمان کەن!؟
وەک دوژمن بەرکیمیامان دەن! بە یەکجاری لەناومان بەن!،
ئەمڕۆ یادی بالیسانە کیمیایەکەی شێخوەسانە
بیست و نۆ ساڵە زامدارم فەرامۆشکراو و بێچارم
کە هەر ناگەن بە هانا مان چیدی مێن بۆ تەماشامان!

هەولێر ٢٠١٦/٦/١٤

## دوو هۆنراوە بۆ هەڵەبجە

١

هەڵەبجەکەم تا شیـری تیا بوو گـۆی مەمکی

بۆ لووشدان کۆمپانیا دەبووە دەستە خوشکی

تا ناوەکەی پڕ دەسکەوتبوو، خۆشەویست بوو

کاتـێ ئـاوەدانی و خزمـەتـی پێـویست بـوو

حیـزب لـە سـەر گـازەرەی پشـت ڕاکشـا بوو

بە بەد مەستی خەونی دەدی خۆی لا شا بوو!

٢٠١٦

٢

ئەم ساڵ شیعرم بۆنانووسرێ ڕۆژی خزمەتە پێت بکرێ

بە کێ بڵێم ئاگای لێت بێ؟ کەسێ نییە گوێت بـۆ بگرێ

حوکمەت درۆیەکی ڕەهایە حیزبیش لەخەمی خۆی دایە

هەڵەبجەش پشتگوێ خرایە پارێزگا بوون کەی ئەوهایە؟

گـەل غەمبـار و بریـنـدارە شـار پـێـویستی بـە کـردارە

گوێـم لـە گریـە و نـاڵـە نـاڵـە بێ ئومێدی و ژینی تاڵـە!

ڕۆژ ڕۆژی پیلانـگێـڕانـە فـیـشـاڵی جـەردە و گـێـڕانـە!

٢٠١٧

## سروودی بۆ سەربەخۆیی کوردستان

من کە پێشمەرگە و شەڕڤانی سەرسەختی سەربەخۆییم
ڕێکخەری ماڵی کوردانم دژ شەڕی خۆبەخۆییم

سەربەخۆ خوازم هەمیشە دڵگەورە و لێبووردەمە
لە خەمی چاکەی وڵات و چەوساوەی ئەم کوردەمە

بۆ چوار پارچەی کوردستانم خۆبەخشی بێوێنەمە
یەکسانخواز و مرۆڤدۆستم چەکوشی ئامادەمە

کوردێکی دانا و بەجەرگم پێدڤێت دەوڵەتم هەبێ
بۆ دروشمبازی کەس ناشێ گەل بهارێ وەک ئاشێ!

بارودۆخ باش بێننە ژێربار تا گشت ببین هاریکار
خۆتان باش چەکدار بکەن بێ خەم مەبن لە داگیرکار

هەر چوار لەتی دڵ و خاکم پێکڕا بن بۆ ڕزگاری
کە ئاڵا ی دەوڵەتتان هەڵکرد بنێ خەن ستەمکاری

جەنگاوەرێکی نەبەزم خاکی خۆم ڕزگار دەکەم
پیلانی هەرێمی و دەولی بە هزرم لە کار دەخەم!

من که پێشمەرگە و شەڕڤانی سەرسەختی سەربەخۆییم
لە ڕێکی ماڵی هەمووانم دژ فیتنەی خۆبەخۆییم

سابیریش دایمە دەسووتێ بۆ چاکەی ئەم میللەتە
دەسا کوردینە یەکبگرن گەل دەرکەن لەم زیلەتە

٢٠١٦/٥/١٥

## فیشاڵی مێژوو

هەندێ مێشکیان قوفڵ دراوە عەقڵیان لەسەر دا نەماوە
چارەی نییە! چی فێربکەی؟ چەندی هەوڵی لەگەڵ بدەی

ئاسنێکی ساردەکوتراوە لەسەروەختی خۆی جێماوە
گیانداریکی بیر سەقەتە مایەی سەر ئێشە و خەفەتە

خزمەتکاری ستەمکارە بەڵتەجی دزی غەدارە
بە وەهمی ئاینی و کوردێنی دواڕۆژی گەل دەسووتێنی

چەوساوەکان دەڕەتێنی عەقڵیشی فلسێک ناهێنی
بە فیشاڵی مێژووی کۆنە نانی کۆنە چاڵ لەڕۆنە!

هەولێر ٢٠١٥/١١/٣

## لەناو ڕەزان

ئەرێ کاکە لە ناو ڕەزان کەوتینە دەست جەردە و دزان!
گەر گەمژە و بەرژەوەند خوازان ملکەچ نەکەن وەکو قازان!
نەبنە پەیژەی گەندە و بێکەڵک کۆیلەیی نەبتە پیشەی خەڵک
گورگ فێر نابێ بە پەزان نابینە مەزاقی سەگان!
ئەرێ مامە لە ناو ڕەزان ! کەینێ دەیخۆین میوەی هەرزان؟
لە سەرمانا گیانمان تەزی میریش سەرمایەمان دەدزی!
کەمتیار بەربۆتە ناو پەزی! بێ شوان خیتکراون بە حیزی!
خۆشی لە بنکردەی وڵات! کڵاومان گرتووە با نەیبات!
تلی لی لی و قلی ویلی ! لێرە دز پێی هەر نازەلی!
ڕێوی بێ ترس تێدەپەڕی ! سەگ بە بەڵتەجی ناوەڕی!
ئەردوئاسمان بەدەست جاشە خەڵکیش داڵغەی لای مەعاشە!
وڵاتمان پڕی لە سیخوڕە ئازادیشمان حاڵی شڕە
قورقەپ کەن، خۆ لاڵ و پتکەن! بۆ گەندەڵبازان چۆک دادەن!
دەبێ جوان پێیان هەڵ بڵێن سەرتان بۆیان لە هەشێنێن!
بەرازی دەست ڕاهاتوونە لە کۆنرا پێمان فێر بوونە!

هەولێر ٢٠١٦/١٢/٢

خیتکراون: قووتدراون

هەرزەلی: ساتمەی کرد، خلیسکی برد

# شەڕی کورسی

(لەسەرو بەندی کێشمەکێشی کورسی سەرۆکی هەرێم)

پـــێم بڵـــێن ئەو هەرایەی ئەم هەرێمـــۆکەم لە ســـەر چیـــیە؟
واق ورمـاوم چمـا ئـەو شـەڕە شــەڕی دۆلار و کـورسـیـیــە؟
ئەم هێرشـــــی ئەلکترۆنیـــــیە قێـــزەونە لە پــــای چیـــیە؟
ئـەم تـرس و تۆقانـدنـە گشـت بـۆ زەحمەتکێـش و بـرسیـیــە؟

بۆچـــارەی دەردی بێکـــاری و قەیرانـــی بـــێ مـــووچەییە؟
عیلاجی کـــۆچی گەنجانـــە دەرمـانی ســەرگـەردانـیـیـــــە؟
خەڵکیـــنە توخـــوا هەق بڵـــێن بـــۆ ئـــازادی و کـــوردێنییە؟
یـــاخود : شــێت و شـــەیداییە؟ ئـاوێزان بـــوونی کورســـییە؟

گێچەڵـــی بـــودجە و پیتـــرۆڵ و گـــومرگی حیزبـــی دزیـــیە؟
بـەدوو ئیـدارەیی و شـــەڕی ناوخــۆ گەلتان زراو بــــردیـیـە؟
تـا تـاکو هەیـن بڵێـین گەورەم لە خۆتـان دێ چارمـان چیـیە؟
بـا لەم ڕەوشـە دەربازمـان بـێ گۆشـت هەر قـابیلی بـازیییە؟

کورســـی هەر قـابیلی گـورگە نەک ڕێـوی و مـامز و تـاژیییە!
ئـــەم هـەژمـوونی خێـڵبـازییـە دژی ویـستی چـاکســازیـیـە
کورســــییەک بە چەقە چەق بـــێ چارەنووســـــی ناســـازییە!
ســەپاندنی شـــەڕە شـەق بـێ وڵاتــی بـێ یاسـا و قــازییە؟

نه بــــۆ خــــۆش گـــــوزەرانییە  نە بــــۆ نەتەوە ســـــازییە
بێشــک بــۆ پــێچکەی نەگریســـی  کورســـی دەســـەڵاتدارییە

نـــــۆکەرێتی بێگـــــانەیە  میراتــــی خێـــزان خـــــوازییە
بـۆ قــۆرخـکاری و دزیـیـە  ســـولتانیـزمی جـــــەردەیـیـیـە
بێبـــــاکی لە تـــوورەیـی گـەل  هەڵســــــانی جـەماوەرییە

بیست و پێنج ساڵی ڕەبەقـە  شــەڕە کـــورسی و  چەقە چەقە
هێشتاش کۆیلەی حیزبی دەڵێن  مادام حـوکمەت هـی کـوردییە
زوڵمــی خــۆیی قەیـدی چییـە؟ لە هــی غەیـرە باشـتر نیـیە؟
گەر گەل کۆیلە و ژێر چەپۆک بێ  ئاڵاو  بـەرۆک  سوودی  چییە؟

دەڵێـــین: ڕاپەڕیـــن مەرامـــی  گەلـــی بەجـــێ نەهێنـــاوە
بەرژەوەنـدخوازیش دێـن دەڵـێن  گـــەل شـوکرە و خـوا پێـداوە
تا هـەن هـەلپەرست هەرکۆیلەی  ئاغای جـەردە و شێـخی دزن
براکوژی چەمووش،  کاسـەلێس  حیـز فورسـەتن  لە گژ مەرزن!

دەستمایەی ئەم کوردە تـاکەی  کـڵاش و چـۆغە و جامـانە بـێ؟
لیسـتی نـوێی خنکـاوی ئـیجە و کـۆچی گەنجـی بـێ لانە بـێ؟

بە نــاو شۆڕشــگێری ســـەختە و یەکســـانیزمی عەیــار تەمــام
تیـری  ژەهــرو ڕقیــان دا لە  جەســتەی ئەم کــوردە دەرئەنجــام

خەونـی چەوسـاوەی میللەتـیش  بەدی نەهـات بـوو بە سـەراب
بەرهەمـــی خــوێنی شـــەهید و ڕاپەڕینیـــان کـــردە شـــەڕاب!

ئەم شـــەڕە شـــەڕی کورســـییە! نـــاو بـــانگی پـــڕ لە نەنگیـــیە!
ڕەتانـــــدن و بە کوشـــــتدانی پێشـــــمەرگەی مەرد و برســــییە

کێشـــمە کێشـــی مێـــژووی قەڵـــپە! موکوڕبـــوونی بەد بەختتیـــیە
لاپرســـەنگییەکی غەزریـــوە مرخـــی میـــری ســـەر تەختیـــیە!

گەرداوی ئـــــاژاوە گێـــــڕی و ســـــتەمکاری و تـــــاکڕەوییە
ئـــــالوودە و ئـــــاوێتە بـــــوونی پڕۆســـــەی دژ دیموکراســـــییە

زوڕنـــــا ژەنـــــی و گەلـــــۆرییە چانـــــدنی بـــــێ ئومێـــــدییە
خـــوایە کەی ڕزگـــار دەبـــین لەم نـــاهەقی و زوڵـــم و زۆریـــیە؟

لەم کورســـــــیە فەنتەلۆســـــــییە ڕەزا قورســـــــە لەعنەتیـــــــیە؟
لەم مەلایـــــی و جەلالیـــــیە قیـــــڕ و بێشـــــتە مێـــــژوویە!

لەم حـــــەزی لیـــــرە و دۆلار و تـــــومەن، دینـــــار، پەرســـــتییە؟
ئەم شـــــەڕە شـــــەڕی کورســـــییە شـــــوورەییە و نەگبەتیـــــیە!

هەولێر ۲۰۱۵/۸/۲۰

## دەلۆی لۆ دیسان حەیرانە

سەری ساڵە و خەڵکی خەریکی ئاهەنگ و خۆشی ژیانە
کوردی بندەست، بەستەزمانیش لەناو کۆڕی بەرخودانە

وا لە باکوور و ڕۆژ ئاواو باشووری ئەم کورد ستانە
کەوتووینە بەر هێرشی موشەک وخومپارەی جەندرمانە

لە ماردین و نسێبین و شرناخ و دیاربەکر و وانە
ڕاپەڕینە و خەباتی خۆسەری هەقە و هی هەمووانە

کۆمکوژی ئۆغلوی بەدفەڕە و ئاق قۆینلووی دێر زەمانە
داعشگەری شەڕداهێنە سپیکەرەوەی ڕووی بەعسییانە

حیزبگەری خۆسەپێنە هەڵگری درۆی تێکۆشانە
دەلۆی لۆ دیسان حەیرانە کورد دژی کورد لە پیلانە!

هەندێ سوغرەکێشی عەجەم هەندێ هی ئالی عوسمانە
حەیران دەردێ مە گرانە هەر ناتەبایی و قەیرانە

لە سەرکورسی منمنۆکێ شەڕ و فیتنە و دۆڵ کوتانە
خۆم یەکەم یان تێکی دەدەم! دەڵێی یاری منداڵانە!

نابڕێ بەکرۆکەی خائین و مەلای خەتێ لە کوردانە
ئاخ ئەم گەلە چەند بەدبەخت و بێ دەوڵەت و پشتیوانە

گەرعیبرەت وەرنەگرین دەنا دەبینە پەندی زەمانە
چیدی کۆیلەی زۆردار مەبن ئازادی مافی ئینسانە

هەولێر ٢٠١٥/١٢/٢٨

## ئاڵا

ئەم ئـــاڵایە پـــاک ڕابگـــرن مەهـــێڵن نـــۆکەراوی بـــێ
خـــوێنی لە پێنـــاو ڕژاوە لـــێمەگەڕێن جاشـــاوی بـــێ !

ڕێمەدەن بەدەستی جەردە و چەتەی قۆڵبڕ چڵکاوی بـێ
بابۆدەولەتی کوردی بـێ! یەکبـوونی گەل بێچـاوی بـێ!

هەولێر ٢٠١٥/١٢/١٧

## بۆ ساڵی نوێ

هیـوا خـوازم سـاڵی نـوێ گەل بە هوشـیاری هەنگـاو بنـێ
کیـــنەی حیزبـــایەتی نەگـــریس بە یەکجـــاری وەلا بنـــێ
بـا گشـت چەوسـاوەی مـافخوراو بـۆ دابینـی دادپەروەری
یەکبن لە ئاست جەردەی بێزراو خۆیانیان لێ بکەن بێ بەری!
٢٠١٥/١٢/٣١

## چاوەڕوانی سەرفرازی

"لە وەڵامی ئەپلیکەیشنێکی fc دا نووسیومە"

دەمویســـت ئەو ئاینـــدەی کە چـــاوەڕوانمە، ســـەرفرازی بـــێ

بـــا زاڵمـــی خـــوێن ســـاردیش هەر خەریکـــی گەنـــدەڵبازی بـــێ !

من چیم ناوێ جـگە لە خۆشەویســتی و گەل لـێم ڕازی بـێ

هەر توانـــایەکیش کە هەم بـــوو لە خزمەتـــی وڵات بەرزی بـــێ

ئەو سادەییەش ویستی خۆمبوو بۆ دوای مەرگم شانازی بـێ

هەولێر ٢٠١٦/٥/٢٩

## کش وماتی

هـات وهـاوارو دەنـگەدەنـگ

ئاسانـەخەڵکی دەیـبـیـستن

کشوماتی هـونەرە لێی

تێبگـــەن و پـێی بهـــەسـتـن!

٢٠١٧

پێی بهەستن: هەستی پێبکەن

# چیرۆکی ڕزگاربووەکی ئەنفالکراو

"ئەوەرووداوایکی ڕاستەقینەیە، لەتەلەفزیۆنی کابرای ڕزگاربووم بینی، منیش کردمە ئەو چیرۆکە شیعرە".

هەرلەوبەیانیەوەی دەورەی گوندەکەی ئێمەیان دا جاش
عەفلەقی گریان بەردایە ماڵی جوتیاری کورد بەلاش

هەر هەڵڵابوو! بەزەندیق و بێدین ئێمەیان بانگ دەکرد
پێیان فەرمانی خودابوو، سەرەویان بۆ گشت لا دەبرد!

ئەوەی گرتیان ئەوەی بردیان لە زیل و ئیڤایان پەستا
کیژو کوڕی سڤیلیان لۆ ئەنفال لوول دەدا، بەبێ خەتا!

کوردی جلخوار، جۆخۆرەکان! دەسکێشبوون تاکوناموسی
گەل بە تاڵان بدەنە دەست لەشکری فاشیستی بەعسی!

ڕاوێژکار بۆ فەردە پارە و دۆلاری شین، شێت وهار بوون
چونکە ئەوان لە بنەڕەتدا ناڕەسەن و نا لەبار بوون

چیم دی لەو ڕێ وبانە خەڵکی سەر بە عەگال کۆمەڵ کۆمەڵ
فرکان فرکانیان بوو بۆ گردانی بەشیان چەشنی ئاژەڵ!

ژن و پیاویان جیاکردەوە تاقم تاقم، لێکیان گرێدا
سەدان کوردی لێو بە باریان لە ئۆردوگایێک فرێدا

به چاو بەستراوی، بەئیمشی ئیمشـی بـۆ بیابـان ڕاپێچـراین
بە برســێتی و بە تێنــوێتی، وەک ئــاژەڵ بــۆ مــردن بــراین

وەلەک! هـاتن دەسـت بە شمشـێر
بۆســـەرپەلدانی بەرخـــی نێــر!

کەسەیری ئەولاو ئیملامکـرد بیابـان ببـووە دەریـایەک خـوێن
هەر وەلەک بوو بەحەی یاهوو کوردی دەدا بەر شەق وجـوێن

بینـیم شــەڕ بــوو لە ســەر پـڕدانە ژنـی کـوردی بە نـاموس
هەر جل زەیتوونی بوو دەیکرد کارێک نەینووسـیبێ قـاموس

کە بە شــۆفەڵ ئەنفــالچی ئێمەیــان زینــدە بەچــاڵ دەکــرد
بەر دەستڕێژی گوللەش دەدراین بە پەلە پەل و دەسـت وبـرد

نــازانم؟ چــۆن دەســڕێژی ئەم وەحشــیانە منــی نە پێکــا؟
لە تـاریکی خـۆم دابـووە پەنـای تەرمـی مـام عەولا و کـاکە!

کە زینـــدە بەچاڵیـــان کـــردین نـــزا و نـــاڵە و گـــریە و ڕۆڕۆ
عەرشی خوای دەهێنا لەرزین! وەلام نەبـوو کەس نەیگـۆ لـۆ؟

وەک مـوعجیزە مـن نەکـوژرام! دواتـر هـاتمە دەرێ لە چـاڵ
چـوومە گونـدێک بە نـاڵە نـاڵ لێیـان وەرگـرتم عەرزو حـاڵ

یارمەتیانـدام و دەربـازبووم! نـاوم بـووە ڕزگـاربووی ئەنفـال!
ئەوەی باسـمکرد ڕاسـتیبوو بەڵام نـزیکترە لە خەیـال!

ئەنفـالە دیسـان ئەنفـالە! ئەنفـالی کـوردی بـێ سـەرە
لە شەنگاڵ و کەرکوک، گەرمیان هێشتاش خەتەرمان لەسەرە!

گەر ئەم کوردە پەند وەرنەگرێ ئەنفـالچی خـۆی مەڵاسـداوە
کەسێتی نوێ و پەروەردەی نـوێ نێـتە کـایە، کـورد فەوتـاوە

عەرەب و تـورک و عەجەم گشـت کلکیـان لە یەک گرێـداوە
کـوردە دەی خـۆت داتەکێـنە لە هەر چـی کەلتـووری گـڵاوە

دەسـەڵاتی کـوردی تـاکەی؟
ئەنفالچیـەکان پەنـا دەدەی؟
بە بەرچاوی پاشماوە زووخـاو چێشـتووەکان، ڕێزیـان مەگـرن
ئەوان هەنـد بـێ حەیـان دەنـا هەقبـوو بە زینـدوویی بمـرن!

٢٠١٥/١٢/٢٥

## چەکداری حیزبی

"کەکوڕەمەسئوڵ لەسەر فول لایت خەڵک دەکوژێ"

حیزبـــی مـــن حیزبێکـــی دڕ و ئـــازایە
کـــێ فـــززەی لێـــوەبێ یەکڕاســـت کـــوژرایە

خۆتـــان لـــێم لادەن، دوور کەونەوە خەڵکیـــنە
هەر کێـــی بێـــتە پێشـــم کوشـــتنی یەقیـــنە

عەنـــتەری حیـــزبیم و ئامـــادەی شـــەڕم
هێنـــــدە لەتـــــرازم بـــــێ هۆکـــــار لە گەڕم

حیـــزبەکەم چـــونکە کـــۆنە شۆڕشـــگێڕە
ڕفتـــار گێـــڕە و گەلـــی پـــێ بەڵاگێـــڕە!

مـــن کـــوڕی مەســـئولێکی ئەو حیـــزبەم
فووڵ لایت سێ فیشەک! هۆڕن؛دوو بۆ ناودەم!

دەکـــوژم دەبـــڕم بـــێ خەم، حیـــز بـــم لە پشـــتە
کێـــی ورتەی بـــێ لە عاســـتمان بـــێ ڕەوشـــتە!

چەکـــداری حیزبمـــان بە دەر لە یاســـایە

خەڵکی دەکوژێ و دادگـاش چـاوی نووسـایە!

لە مەیـــدانی شـــەڕی داعـــش، هەر هەژار

پێشـــمەرگەیە و شـــەهیدە و وا لە ژێـــر بـــار!

ئـــافەرین حیزبـــی بکـــوژ ســـەر ســـەلامەت

گەلـــت خســـتە قـــات وقـــڕی وهـــیلاکەت!

هەولێر ٢٠١٦/٥/٦

# کۆمپانیای خێرخوازی

"کۆمێنتێکم بۆ پۆستێکی ع ح س سەبارەت پێدانی تەندەرێک
به کۆمپانیایەکی حیزبی، بەتاڵان !"

ئەم کۆمپانیـــانە هـــی خێرخـــوازانە؟
یـــان هـــی گەنـــدەڵترین چەتەی دزانە؟

خەڵکـــی تێناگـــا هـــی خێـــر خـــزانە★!
ئەم پـــارە مـــۆڵەش بـــۆ مۆڵەکـــانە

هەیە لەمێـــــژە ســـــاحێب قـــڕانە!
خەریـــــک دۆلار و زێـــــڕ و گیرفـــانە

حەیـــران حەیـــرانە دەردی گەنـــدەڵچی
ئەم نیشـــــتمانە زۆر بـــــێ دەرمـــانە

کلیـــل بەدەســـتی قاســـەی نهێنـــی!
شۆڕشـــــی کـــۆن و نـــوێی کـــوردانە!

پێشـــان گـــومرگ و زەوی و ســـــەرانە!
ئێســـتاکەش نەوتە و قیـــڕیش ئاســـانە!

کاک عەلی★ بۆچی خۆت مانـدوو دەکەی؟

بە تـــاقی تەنهـــا چـــۆن باریـــان دەبەی؟

چڵکـــــــاوخۆرێکی زۆریـــــــان لەلایە

دائـــیم خەریکـــی ئەشـــەو بـــیللایە!

جـــاش قەڵەمێکـــی پیســـــکەی هەڵەوەڕ

تەڕادێنییەتـــــی دەهێنـــــێ ســـــەگوەڕ

ئاگـات لەخـۆت بـی لوشـکەت لـێ نەدەن!

نەتـــخەنە لیســـتی مەغـــدووری وەتەن!

هەولێر ٢٠١٦

خێرخز :دز بە تورکی

★ عەلی: پەرلەمانتار

## سەرۆك و كورسی

" لەداخی كورسی پەرستی و كۆیلەی حیزبی"

ئەگەر سـەرۆكی غەدر بمـایە
ڕەنگبـێ ئـاوام بـۆ بنووسـیبایە
لە زێـڕ و ئەڵـماس گـران بەهـاتری
ئێـرە تێـک دەچـی ناشـێ تـۆ بمـری!
بەخـوا زۆر شـازی شـاهی شـاهانی
فریشـتەی خـوایی هەنـد میهرەبـانی
كورسـی و عەرشـی زێـڕ شایسـتەی تـۆیە
گەر تۆمـان هەبـی وڵات سـەر بە خـۆیە!
بـژی سـەرۆكی بێـوێنەی دونیـا
كورسـی هەر شـایەن تـۆیە و تـۆی تەنیـا!
دیكتـاتۆریش هەر بە خـۆت چـێ دەكـرێ
تـۆ نەبـێ كـێ ڕێـز لەو گەلە دەگـرێ؟
هەر بەر قەرار بیـت سـەرۆک و كورسـی
چـش !اله گەل دەبـێ ڕەزیـل بـێ و برسـی!
گەر سـەرۆک بـاش بـی ژیـان تـامی هەیە!
یاسـا و دادوەری و دەسـتوور فشـەیە!

٢٠١٦/٧/٢٩

# لاوکی چیای شەنگاڵێ

۲۰۱٤/۸/۳ ئەم کارەساتە مێژووییە ڕوویداوە.

۳ /۸/۲۰۱٦ ئەم لاوکە شیعرەم نووسیوە، پێشکەش بە: "قادر خۆرانی"و ئەوشەڕڤان و پێشمەرگانەی کە ئەوێ ڕۆژێ هەڵنەهاتن و بەرگریان لەئێزیدی سڤیل کرد."

هەی لێ لێ لاوکۆ فەرمانە

هاوارتە لە من فەرمانە

ئەو پەلامارە چەپەڵە بۆ قڕکردنی ئێزیدییانە

فەرمانی حەفتاوسێیەمی بەغدادی وئالی عوسمانە

شیرەشیر و هاش و هووشی ڕیشچڵکن و کاڵفامانە

بۆ بە کەنیزەک بردن و ئەتکی کیژۆڵە و ژنانە

چیای شەنگاڵێ جێگەی مێر و عەگیدانە

ئێزیدی تیای عاسێیە و لە بەرخودانە

خەڵکی سڤیل، ئاوارە و پەرتەوازەنە

لەسەر چیایێ، چاو لەڕێی خۆری تازەنە

دەروێشی عەبدی هاوارە!

نامووسی مە لەخەتەرە

ئەم چیرۆکە شەرمئاوەرە

پیلانێکە، تەژی ڕووداوی درندانەی پڕ ئازارە

چەتەی داعش بە ناکاوی کەوتیتە ناو کیژوکارە

پیلان پیلانی دەرەکی و ناوخۆییە!

هەڵات هەڵاتـــی چەکـــدارانی حیـــزبییە!

گەلـــۆ ڕابـــن، ئێزیـــدیاتی کـــوردی ســـاغن

گشـتتان یەکبن، دژی ئەوتـاقمەی بـێ زاغـن

گازکەنە گەلێ مە خڕیـان، هەی لێـی لێـی لـێ

ئەنفـاڵچی بەخـــۆ کەوتیـــنە، لە شـــەنگاڵێ

بەنـــاو خێزانـــان وەربـــوونە، چـــووینە مـــاڵێ

بۆتـــاڵانی و یەخســـیرکردنی ژنـــان هـــاتینە

هـــاوارتە لە مـــن، لـــەو دەورە!

وای لەم بـــێ مـــۆڕاڵییە گەورە!

لەم سیناریـــۆ پـــڕ لە غەدرە!

هەی لـێ لـێ لـێ، هـاوارە لاوکـۆ هـاوارە

ئێشـــکگری، بـــە نـــاو پـــارێزەری شـــەنگاڵ

قـوچاندیان و ڕەڤیـن وەک تەیـر گرتیـان بـاڵ!

ڕاکە ڕاکە !بەرگرییـان لە ڕوومەتـی شـەنگاڵێ نەکـرد

تێیان تـەقان ! لە بەردەم داعشان ڕووخـــان!

بـۆ کوردســـتانی بریـنـدار، هیچیـان نەکـرد؟

خـۆیان نـەکردە قوربانی و نـەبوون بە پـرد

لـــەوڕۆژەوە شـــەرم دەکەم لە کوردبـــوونم

بێـــزم بـــۆوە لەم شێـــوازەی مرۆڤبـــوونم

هەی لـۆی لـۆی لـۆ، دیسـانێ لەمە فەرمـانە

هـاوار بـۆ پێشـمەگەی ڕاسـتی و شـەڕڤانانە

چیـای شـەنگاڵێ جـێگەی مێـر و عەگیـدانە

ئەوە سـەرێ چەنـد مانگـانە ئێزیـدی وا پەرگەندەنـە

خەڵکی سڤیل لەسەر چیایێ چـاوەڕێی خـۆری تـازەنە!

هەی لـێ لـێ لاوکـۆ فەرمـانە خەبەر بـدەنە شـەڕڤانانە

بێـنە هانـای حـورمەتی ڕاوەدوونـراوی، شـەنگاڵییانە

لاوکـۆی مـن چەکـی لەشـانە لەسـەنگەری کـۆڵنەدانە

ئـەوە سـەرێ چەنـد سـاڵانە ئێزیـدی لەوێ عاسـێنە

خەڵکی سڤیل لەسەر چیایێ چاوەڕێی ڕۆژێکـی نـوێنە!

هەولێر ٢٠١٦/٨/٣

## غەدری خۆیی

ڕاســـتە تێـــر ئاگـــای لە برســـی نیـــیە
دەســـــــەڵاتداریی بەرپرســــــیارییە

مامۆســـتای دڵســـۆز فەرمـــانبەر تێکـــڕا
نـــا بـــۆ پاشـــەکەوت مـــووچەی لەتکـــرا

خانەنشـــینی ڕاســـت پشـــتگوێ خـــراوە
دمبگچـــی حیزبـــی هـــا لە ســـەرچاوە

بـــۆ نـــۆ مانـــگ دەچـــێ حـــوکمەت قەرداره
تەقەی ســـــەری دێ هێنــــــدە زۆرداره

حـــوکمی خۆمـــاڵی کـــورد قەڵـــپ دەرچـــوو
خەون و خەباتمـــان گشـــت مـــایەپووچ بـــوو

غەدر هەر غەدرە هەر کێـــی پێـــی هەڵســـێ
غەدری خـــۆیی بـــۆن ســـۆی لـــێ هەڵدەســـێ

گەر پێتـــان نـــاکرێ مـــیللەت بەخێـــو کەن
بـــــڕۆن وازبێـــــنن یەخەمـــــان بەردەن!

هەر کەســـێ داوای مـــافی خـــۆی نەکـــا
چەپـــڵە بـــۆ حیـــزب و نـــاهەق لـــێ بـــدا

گومـــانی هەبـــێ لە مرۆڤبـــوونی خـــۆی
هەر ڕوو زەردی و خەجـــاڵەت کەمە بـــۆی!

٢٠١٦/٩/٢٦

## کۆنە قەوان

سـەیرە ئێـرە، کـێ لە سـەر هەق   هەڵـداتێ گەفـی لێـدەکرێ
کـێ پێشـمەرگەی گەل و ولاتبـێ   مـۆری خیـانەتی پیادەنـدرێ!
ڕەش بۆتە سپی و سپیش بۆتەڕەش  جەردە بەجوامێر دەژمێردرێ
کـێ پیلانچـی، تیرۆرچـی حیزبـی  غەدار بـێ، پـاداش دەکـرێ

کێـی ڕاپۆرتنـووس، بەد کـردار بـێ   بێتـام ڕێـزی لـێ دەگیـرێ
هەر کێـیش پـاک و ویژدانـدار بـێ   پـتر تیـری تـێ دەگیـرێ

هەن پێم دەڵێن  شـیعری تـووڕە و هەڵوێسـتی ڕوون بەدیـارمەخە
بـا نەچـیە لیسـتی مەغـدوورین!  لاپەڕەی فەیسـەکەت داخە*!

بەزمە  لێرە! پێشمەرگە؛جاش! جاش؛پێشـمەرگەیە و کـوڕی بـاش!
کێ بوختانچی و سوخەنچین بێ   لای باشدز سەرچاو دادەنرێ!

لە بنەبـانی دیوەخـانێ  جـێگەی نەرمـی بـۆ ڕادەخـرێ
دیـقەت دەنـێ، سـەیرە ئێـرە  زەمەنـی پـڕ غەدرە ئێـرە

کـێ چاکسـاز، دژ سـتەمکار بـێ  ئـاژاوەچی و مـاڵوێرانە!
کـێ فیتـنە چـی و دەغەزار بـێ   مامۆسـتای وەفـادارانە!

مەرگ ژیـانە و ژیـان مەرگە!  هەرچـی قێـزەون بـێ جـوانە!
مێشـکی مـرۆڤ، کڵـۆم بـدرێ   پـڕ وەهمەبـێ و پـێچەوانە

زوڵمـی زاڵـم چەنـد ئەسـتووربێ  تێچـوونی لە بەرچـاوانە
ئـاگرە سـووربێ و لەخـۆم  دووربـێ!  بشـکێ ئەم کۆنـە قەوانە!
٢٠١٦/١٢/١

کڵۆم بدرێ:کلیل بدرێ

## دەردی پاییزو پیری

پـــاییزە گـەڵاڕێــزانــە وا تووشــی دڵشـکان هـاتووم
بە شمشــێری بــێ وەفــایی غەدری زەمــانە ڕاهــاتووم

لە جەنگێکی نابەرامبـەر چەرمەسەرییەک یەخەی گرتـووم
حـوکمێکی خـواری خۆمـانە، دواڕۆژی گەلـی لێـڵ کـردووم

غەمــی قـووڵی سـتەمکاری ڕۆشــنایی چـاوانی بــردووم
پیرییش سەرباری خەمباری هێز و ئومێدی لێ سەندووم

یاران داخــی دڵـم گـرانە زامـی کۆنی بە سـوێ خسـتووم
سڵاوێ دەنێرم بۆ یارم هەرچەند دوورە و بەجێی هێشتووم

بەڵکـو بەئاوڕێـک، نامەیێـک بمبـووژێننەوە وەک پێشـووم!
تا بـۆ گەلـی زوڵملێکـراوم بـێمە مەیـدان وەک سـەر لەزووم

بڵـێم بەسـیە غەدرو دزی دەســتدەمە چەکـوچ و تەرازووم
خوێنی پێشمەرگە ئاو نییە؟ با نـەکوژرێ لەشـەڕی شـووم

تەنیـا لە ڕێی کوردستاندا شەهیدم لە ترێ سەی نەچـووم!
مـنم خەمکـی خەمـانی کـورد کە مـردم وا بـزانن نەبـووم!

٢٠١٦/٩/٢٤

## شیعر جوانی درەخشانە

"بۆئەوانەی دەڵێن شیعری بڕگەیی خۆری ئاوابووە"

نەمـــانی کـــێش و بـــڕگە جـــاڕدانی مەرگـــی شـــیعرە
گەر هـۆنراوە بـێ سـازبێ بـێ تـام و خـوێ و ئـاوازبێ

ئەوەکەی پەیڤـــی شـــیعرە؟ بـــێ ڕوونـــاکی و ئـــاگرە !
ئـــازادییەکەی ڕەهـــابێ ڕەونەقـــی شـــیعری نـــابێ!

شـیعری بـێ کـێش و سـەروا هەر وەک نەخشـی سـەرئاوە
تارمـــاییەکە دێ و دەڕوا خەیـــاڵ پـــڵاوی نـــاوە !

مەرگە بـۆ جـوانی وشـــە ڕای خـۆمە، وام پـێ باشـــە!
هزری جوان هەڵوێستی جـوان خەیـاڵ و ئیلهـامی جـوان

شـــیعری چێـــژدار واتـــادار نەمـــر دەکـــا هـــۆنەروەر
شـــیعر خـــۆری ڕاســـتییە ڕوونـــاکی پەرســـتییە

نەک وشـــەی جڕنـــاو فڕنـــا بـــێ مۆســـیقاو بـــێ ســـەدا
ناو لێ بنێـی شـیعری نـوێ بـێ تـام و بـۆن و بـێ خـوێ

شـــيعر هيـــوا دەچێنـــێ   بەدی لە ڕەگ دەردێنـــێ
شـــيعر وێـــنەی ڕەنگيـــنە   هـــزری قـــووڵ و ســـەنگينە

ديـــــواری لە پـــــۆلايە   بـــــاڵا ی بە قـــــە د قەلايە
شـــــيعر وەک پەڕەی گـــــوڵە   کيـــــژی ناســـــکۆ لە دڵە

شـــيعری قەشـــەنگ و نـــازدار   ســـارێژ دەکـــا زامـــی يـــار
نەبـــوونی کـــێش و بـــڕگە   لێـــدانی شـــيعرە مەرگە!

شـــــيعری تەڕ  وەک بـــــارانە   شـــــەونمی بەربەيـــــانە
مـن حەزم لـــە پەخشانـــە  شـيعريش جـوانی درەخشـانە

هەندعەشقی شيعری بەرزم   وشـەی جـوان وێـنەی تەرزم
وەک پەپـــــوولەی ســـــەرگوڵان   دەنيشـــــێتە ســـــەردڵان

هەولێر ٢٠١٦/١٠/١٢

# تاڵاوی چاوەڕوانی

لە بـێ تـۆیی پەشـۆکاوم  دڵەکەم وا شـیوەن دەگێـڕێ
گشـت کـاتێ وای لە بەرچـاوم  هەرچـاوەڕێتم چـاوەڕێ

لەوەتـای تـۆ لێـرە ڕۆشـتووی  ئەم شـارەم لا کەلاوەیە
دونیـای ڕوون نـابینم ئەوەی مـاوە دیـاری و پاشـماوەیە

دەزانی من  بێ تۆ چـۆنم ؟ سـەرم وەک ئـاش وایە کاسـە
نـوقمی خەیـاڵی دووری تـۆم، نـازانم دونیـا چ باسـە؟

تۆش لە گەڕان و سەیرانی  هەرخەریکی کەیف وسـەفای
منت تەنیا جێ هێشتووە  یـاری زاڵـم چەنـد بـێ وەفـای

باوەڕنـاکەم  هیچ  بریـنێ   ژانەکەی هێنـدە بەسـوێ بـێ
بەم دەردەت سەر دەنێمەوە  من لێـرە بم  تۆش لەوێ بـێ

چاوەڕوانیـت لە تـام دەرچـوو  نابڕێتـەوە و نابڕێتـەوە!
تـاڵاوێکی وات پـێ نۆشـیم   قەت لە بیـرم ناچێتـەوە!

ساڵی ١٩٧٥ نووسراوە ٢٠١٥ پێیداچوویمەوە

# ئەنفال و ئەنفالچی کۆن ونوێ



دار گەر نەبـــــوایە بە کلکــــــی تەور
هەزار ســـاڵ دەژیـــا دەگەیـــیە هەور

کـــوردیش گەر خـــۆرە تێـــی نەدابـــایە
دەبـــووا وڵاتەکەی ســـەربەخۆ بـــووایە

جاشـــی ڕاوێـــژکەر! وەک کەوی ڕاوبـــوو
بـۆ هاوزمـانی خـۆی، خـۆی دان و داو بـوو!

داخـــی گـــرانم بـــۆ ئەو زڕ کـــوردانە
چاوســـاغ، وەک کەوی ڕاوی خۆمـــانە

چـــوونە نـــاو لادێـــی جوتیـــار و گـــاوان
خەڵکیـــان تەفـــرەدا بـــێ ســـووچ و تـــاوان

گەر نـــا ئەنفـــالچی بیـــانی نـــاتوانێ
بە هـــیچ ســـووڕەتێ بیـــان ئەنفـــالێنێ!

کـــوردە ئیـــدی بە کەس مەخەڵەتـــێ
مشـــووری عەدل و یاســـا و دەوڵەتـــێ!



دار گەر کرمـــی خـــۆی نـــاخی کلۆنەکـــا
ڕەنجـــی بـــاخەوان قەت نـــاچێ بەبـــا

کەوبـــازی ڕاوچـــی کەو دەبـــات بـــۆ ڕاو
ئەنفـــالچی بیـــانیش، خـــائین و دۆڕاو !

نـــا دادپەروەری و حیـــزب حیزبێنـــی
پاشـــماوەی ئەنفـــال دادەڕزێنـــی

جیـــاوازی نیـــیە بەعســـی کـــۆن و نـــوێ!
ئەنفـــالچی داعـــش، تونـــدڕەو لە هەرکـــوێ؟

کـــێ کوشـــتنی مـــرۆڤ حەڵاڵ کـــا بە دیـــن
چ نـــاوی لێ بـــێ بەدفـــەڕە یـــەقیـــن!

عەرعەری کـــۆن و نـــو ێ لە بیـــر مەکەن
ئەو خوێنە پـــاکە بە فیـــــڕۆ مەدە ن
کـــوردە چیـــدی بە کەس مەخەڵەتـــێ
هەوڵی دەستـــووری عـــەدل و دەوڵـــەتێ
قاســـپە قاســـپی کەو فریـــوت نە دات
نەک دان و داو بێ و بە تـــەڵەت وەکـــات!

هەولێر ؛ ٢٠١٥/٤/١٤

## دەڵێن جام پڕبێ لێی دەڕژێ

"کاتی بێ مووچەییەکە"

چەوسێنەر کاتــێ ڕۆژیەتی  میللەت سەرشۆڕکاو بێدەنگ بێ!
گورج لێی دەخورێ و هەڵپەیەتی  تانیوە مرۆڤ و بێسەنگ بێ

پــرتە و بــۆڵەی مارانگـــاز لای  پــوولێکی قەڵـــپ نــاهێنێ
تـــا نەغەزرێ و ڕانەپەڕێ   مێشـــێك زەوقـــی ناشـــێوێنێ!

بە نیــو مــووچە و نیــو کەڕامەت!  ڕایبکێشـــێ گالێســـکەکەی
تێـــی هەڵـــدەدا وەك مەڕی گێـــژ  دەیهـــاژوا بە نەقیـــزەکەی!

ئەوەی ئێســـــــــتا دەگوزەرێ   ئەنجـامی ناســـــــازیمانە
بیـــانیمان کـــردتە خـــانە خـــوێ و خۆشـــمان چەنەبـــازیمانە!

دەڵێن جام پڕ بێ لێـی دەڕژێ  کاســە بشـکێ نەزرینگێنـدرێ
دەمـــێکە خەڵـــك نـــاگزوورە  بەعەزرەت مـــووچەیە بـــدرێ!

با کۆیلەی حیزب و جاش قەڵەم  دەهۆڵ بکوتێ و زوڕنا بژەنــێ
ڕۆژێک خۆیان و شێخیان سووک  سووک دەبن، لەناو مەفتەنێ

هـــا كـــا چەوســـاوە هەڵســـاوە تە ختـــی زۆرداری ڕامـــاڵی
زۆرهـــات قەواڵە بەتـــاڵە دەچـــنەوە ســـەر ســـاجی عەلـــی!

پەنـــدێکی کـــۆن هەیە دەڵـــێ گـــوریس لە بـــاریکی دەپســـێ
تەنهـــا زوڵـــم لە ئەســـتووری تەڵاق دەدرێـــتن ســـێ بەســـێ

تـــا کـــار لە کـــار نەتـــرازاوە دەردی ئەم گەلە تـــیمار کەن
دەنا وەك شای مێژووی شکست دەبـــێ لـــەم وڵاتـــە بـــار کەن!

هەولێر ٢٠١٦/١/٢٤

## گفتوگۆی مووچەخۆرو حوکمەت

مووچەخۆر:

دەڵـێن حـوکمەت غەزریـوە! مـووچەی خەڵکـی بڕیـوە
بەغــدا ئەوەنــدەی نەکــرد ئێــوە بە ســۆدرەتان بــردا!

حوکمەت:

ئــاخر ئــێمە نــازدارین! لە حـــوکمەتی و بێـــزارین
سەدا حەڤـدەش نەمـاوە بیخـۆین وەک چـایی و قـاوە!

مووچەخۆر:

تــاکەی درۆ و دەڵەســـە؟ ئەم فــاک و فــیکە بەســـە!
ئەی پارەی نەوتی بۆڕی ؟ بۆ دەخۆن بە ســەر شـۆڕی؟

حوکمەت:

هەی نەفامی چاو چنۆک دەبــێ بـۆم بێـیە سـەرچۆک!
مــنم شــێخی خۆتــانم گــێلمە گــێلمەی نــازانم !

مووچەخۆر:

نەفـت بـۆ حەفتـا هەسـتاوە حـوکمەت پـاڵی لێـداوە
هەر جارەی بە بیانوویەك فیشـاڵ دەدەیـتە پـاڵ یەك !

حوکمەت:

ئێـوە چەنـد چەقاوەسـوون بێڕێـز و بــێ چـاو و ڕوون
چیتــان پــێ دەکـرێ بـیکەن ئەگینـا دەمتـا ن داخەن

مووچەخۆر:

توخوا هـۆ کـاکی حـوکمەت !بمانـدەیێ مـووچەی لەت
ئێمــە بێ پــــارە و پوولیـن نا عیـــلاج و مەلوولین

حوکمەت:

تــا وا وەك مەڕی لەڕ بــن بــۆ ئـێمە کـۆیلەی کەڕ بــن
لێتــان دەخــوڕین بــێ پەروا ســکاڵاتان بــدەن بە خــوا !

مووچەخۆر:

خوا لێتان قەبووڵ ناکا کەوتینە حەلاو وەلا
دەبێ تەفرو توونا بێ کێ بیەوێ گەل ڕیسوا بێ

حوکمەت:

ئەوەی پێم ڕازی نەبێ با لەم وڵاتە دەرچێ
سامانی خاک هی شێخە! کێی دەنگکا چارەی مێخە!

مووچەخۆر:

حوکمەتی سوڵتانیزم ! بێ دەربەستی فشیزم
گەل هەرگیز ئێوەی ناوێ ! دەبێ بکەونە داوێ !

حوکمەت:

مووچە خۆری چاوچنۆک دەبێ بخۆی خاپەڕۆک !
هێندە پارەم پێداوی لێم هار بووی پف هەڵماوی!

مووچەخۆر:

حوکمەتی حەلەق مەلەق ! برسیت کردووین بەناهەق
پوولی نەفت و گومرگت هەمووی پە ستایە ورگت
زەلیلی قەبووڵ ناکەین ئێمەین خاوەن ئەم خاکەین
تا زووە دەبێت لاچی ئەی حوکمەتی دەگگەچی!

هەولێر ٢٠١٦/٥/٢٣

# چاوەڕێی مووچە

چاوەڕێی نیو مووچە دەکەی  هەی مووچە خۆری هەش بەسەر

دیـوتە کەڵەشـێر هـێلکە بکـا ! بیکـاتە دەسـتی بەخێـوکەر!

دەسەڵاتێـــکی نـــەزۆکی   قرچـۆک لە ئاسـتی فەرمـانبەر

بـــاکی نیـــیە بەو مەراقە !خەڵـک بمــرێ، قوڕکــاتە ســەر

وا چاومـــان کـــوێرایی داهــات  نەهــاتی چــارەکە مــووچە!

یان حوکمی کوردی دژمیللەت   تۆپی هاویشتووە وپـووچە!

ئەم گەلە هەنــد بــێ ئومێــد و دەستبـــڕاو و بــێ خـــاوەنە

گیـــرۆدەی دەســـتی نـــامەردی  عاشـــق بە لیـــرە و تمەنە

لەخوێن بەخشین،  فیداکاری  گەل چی لە توانا بــوو کردی

حوکمێکی بێ وەفای خۆیی چی جوانی ژینمان بوو بردی!

مخـــابن وا دەســـخەڕۆ بـــووین ! هیواکانمـــان بەری نەبـــوو

دەیان ساڵ چەقە چەقمان کرد ڕەنجی قەڕنێکمان بەباچوو!

هەولێر ٢٠١٦/١٠/١٦

هەش؛ خم

هەش بەسەر؛ بەدبەخت

هەش؛خم

## ئەنفالستانی ئیجە

"لەداخی چەندین بارەبوونەوەی نقومبوونی یەختی کۆچبەران
لەدەریای ئیجە"

ئەی شەپۆڵەکانی دەریا ماسی و قرشەکانی ئیجە
شەرم ناکەن لە ڕوخسار و کاکۆڵ و زولف و ئەگریجە؟

ئەوانە ژن و زارۆکی وڵاتی هەش بە سەرەکانن!
خەڵکی ماڵکاولی هەڵەبجە و سۆران و جزیر و بۆتانن!

ئەی خواوەندە بەهێزەکە بۆچی تێیان ناخوڕیەوە؟
بەشەپۆلی دەریا بڵێی بەسە ئیتر هێوربەوە!

چیتر یەختی بەختی کوردان نقوم مەکە لەم دەریایە
نا بەڵەدن ڕزگاریان کە لە ناو دەمی ئەم عەزیایە

ئەی خواوەندی لاوازەکان لە شەپۆلی سەرشێت بخوڕە!
پێی بڵێ بەسیە داسەکنێ! زگی مرۆڤی کورد هەڵمەدڕە

ئەی خۆت بەڵێنت پێنەدان نزای لێ قەوماو قەبووڵە؟
بۆچ نایێی بە هانای ئەو بێ مەفەرە لەم دەریا قووڵە؟

هـۆ ماسـيە گەورەكـانى خـوا  نەكەن چـاو و دڵ وجەرگـى
كوردان قووتدەن بەبـێ پەروا  هـى گەنـج و پيـرى بێڕەنگـى

ئەوانەی پـــاڵپێوەنەر و ســــەبەبكاری كـــۆچی ئێـــوەن
خوايە تەفروتوونيانكەی هەر كێ ئـێمەی واخسـتە شـيوەن

دەريـــای ئـــيجە ئەنفالســـتانی وڵاتـــی بـــێ كەســـانە
ئەوێ گۆڕســـــتانی كـــوردی  ڕەتێـــنراو و ســـەرگەردانە

ئـاخر خـوايە! ئـێمەت لەسـەر نەخشـەی دەريـا دانەنـايە
مەلەوان نين! چۆن دەربازبين  لەم قوڕبەسەری وسەودايە؟

يەخت : گەمێ، بەلەمی بچووك

هەولێر ٢٠١٦/٢/٤

## بۆ ساڵوەگەڕی ڕاپەڕین

"لەیۆبیلی زیوینی ڕاپەڕین کەدەستی خۆت دەگەزی"!

وا چارەکە سەدەیەکە ئەم میللەتە ڕاپەڕیوە
لە تەک بازرگانانی خوێن ڕۆژێ خۆشیمان نەدیوە!
بۆ پارەو کورسی دەسەڵات نیشتمانییان هەرزان فرۆش کرد
ئازادییان بن پێ خست و دیموکراسیشیان بە پەند برد!
لە جیاتی پەیوەستبوون بەخاک، ڕەوشتبەرزی و دادپەروەری
دایانهێنا مشەخۆری و پیلانگێڕی و تاقمەگەری
دایانهێنا مۆدێلی میری تاکڕەوی و قەرەقووشی
تا سامان و سەروەری گەل بەبێ شەرم هەڵ بلووشی!
ڕایانهێنا کۆیلەی چاوشۆڕ، ویژدان کڕاو! حزبیگەری
قۆرخچێتی و بەرەڵایی عەشرەت گەری و تۆبزی کەری!
برەویاندا بە تەمبەڵکاری و قەیرانسازی و قات وقڕی!
براکوژی چەمووش گەوجێندراو لێو ڕێژکراو بە ملهوڕی!
ڕاپەڕین، یۆبیلی زیوینی دزە نەك کوردی سووتاو
داپڵۆساوی نادادگەری و ئامانجی چەند کەسی دۆڕاو!
چڕو چاوی ناشۆڕشگێڕ بەرۆکی گەلیان گرتووە
خێر و بێری وڵاتیان گشت لە سەرخۆ تاپۆ کردووە!
خوێنی ئارام و ڕەنجبەرو مامە ڕیشە ش بزر کرا
بەرە و دواوە هەنگاو نرا جاڕی بێ ئومێدی درا

هەولێر ٢٠١٦/٣/٥

# جاشكۆڵەی بە ڕەوشت!

ئەو جاشـــــكۆكە بەڕەوشـــــتە بۆخـــــۆی دەژی لەم سروشـــــتە

زیـــانی بـــۆ هـــیچ كەســـێ نیـــیە ئەفســـانەی ئاســـمان زەویـــیە

نە خەم لە حـــــوكمەتێ دەخـــــوا نە دەرەتێنـــــدرێ نـــــارەوا

لە گیـــاو گـــوڵان، دەلەوەڕێ وەك ســـەگ بە هـــیچ كەس نـــاوەڕێ!

ئەو جاشـــــكۆكە هەنـــــد بەڕێـــــزە ناترســـــێ لە كێـــــی بە هێـــــزە

مافیـــا و ڕێگـــر پێـــی ناوەســـتێ مـــووچە ی ببـــڕێ و داییبەســـتێ

پاشـــــا بە ســـــەپا ن نـــــازانێ بـــــێ خەم لە مـــــووچە نەدانـــــێ!

جاشـــــكۆڵەكی زۆر بەهۆشـــــە گـــــرژو مـــــۆن نیـــــیە ڕووی خۆشـــــە

ئەم جاشـــــكە ناكـــــا چاپلوســـــی چەتەیـــــی و كـــــاری جاسوســـــی

كـــــاری بە لای سیاســـــەت نیـــــیە نـــــازانی پیســـــخۆری چیـــــیە؟

هەر بـــــژی جاشـــــكی قشـــــتیلە قەت خیـــــانەت ناكـــــا وەک فـــــیلە!

گـــــوێی قیـــــتە و كلكـــــی درێـــــژە لە مرۆڤكـــــوژی بەدەســـــت نـــــوێژە!

خـــــوا هەڵنـــــاگرێ بەچـــــكەی كەرە عەشـــــقە لەوەڕ چـــــاو لە دەرە!

نەكەن قەوچ و قەڕاســـــەیكەن كلكـــــی بگـــــرن لە قەوچەی دەن!

بـــــێ زەڕە خـــــاوەن چـــــوار پێـــــیە بە ویقـــــارە لە هەر كـــــوێیە

بوونـــــەوەرێـــــكی بـــــە كـــــەلكە خـــــواردنی كاو گـــــیـــــا و پـــــەلكە

مـــــاكەر د ایكـــــی بـــــێ هاوتـــــایە بـــــە تـــــەرەب زادەی ئاغـــــایە

نێـــــرەی بابەلبـــــاب ڕەســـــەنە خـــــوا پێـــــداوی لا پەســـــەنە!

هەنـــد خـــۆش بەزو تێـــر ئـــاليكه نـــازداره دەڵـــێ ی پەلـــيكه

عـــــەرد و بـــەرد داژوا بێباكـــــه هــاو ئـاخوڕی نيـيه لەم خــاكه

كەس نايگــاتێ لـــه زەڕينـــێ خـــۆی شـــێره له ســـەر جـــۆخينێ

هەركێـــی عاقـــڵ بـــێ خوازيـــاره دوور بـــێ له چڵپـــاوی پـــاره!

دوور بـــێ له نەقيـــزەی حـــوكمەت! نـــاڕوونی داهـــات مـــووچەی لەت

وەک ئەوجاشكه بژی سەربەست ! بێچووی كەری شاد بێدەربەســت

دوور بـــــێ له غەم و پەژاره لەم ژيـــــنه وەك ژەهـــــری مـــــاره

جاشـــكێتی كـــوا دەســـت دەكەوێ بـــەرەڵلابی لێـــره و لـــەوێ!

كه س پيلانـــت بۆ دانـــــەنێ دوور لـــه قەيـــرانچييان بەتـــەنێ

كەرێـــــتی وەك مەدالييايــــــه شەرەفێـــــكی گەورەی تێيايــه

مـــرۆڤ ناگـــات به باشـــی كەر! ســـەد ســـاڵ بـــژی له دەشـــت ودەر!

هەولێر ٢٠١٦/٧/١١

## شوانی وانابی

وا نـــابی کـــاکه وا نـــابی  پێشـــمەرگه له ســـەنگەر دابـــی
ناگزوور و بێ مـووچه بـی  مەسـئول له کەیـف و سـەفابی!

وا نـابی شـوانی وا نـابی  مەڕ له گـورگ و سـەگ چـا نـابی!
سامانی گەل قۆرخ دەکەن ! هێشتاش بەمەڕمـان تێـدەگەن؟

وا نـــابی کـــاکه وا نـــابی  دیموکراســـی وا چـــا نـــابی
خەڵکیـنه نەکەونـــە داوی  حـوکمی تـاقمێکی خوێنـاوی!

کـوردێنی بەم حـــاڵه نـابی  وڵات بە زورنـا ئـاوا نـا بـــی!
ئەم خەونەمان لەگۆڕ مەنێ  مەیده بەر بـا و چەنه چەنـێ!

ڕیفراندۆم، دەوڵەت وا نـابێ ! گەل قوربـان پیلانـی "نـا"بێ
دواڕۆژ مێـژوو قسـەی دەبـێ  که ڕووخـا ئیـدی چانـا بـێ!

له مـن مەدەن له برام بدەن  ڕەشکەی کـایه و دارکـاری کەن
ترستان لەشۆڕشی برسی بی !ڕووخانی کۆشک و کورسی بی!

وا نــابی کــاکە وا نــابێ  حیزبــایەتی ئەوهــا نــابی
گەل پێویســتی یەکڕیزییــە  دەوڵەت بــێ بەرنــامە نـابی!

نــابی ئەز قوربــان وا نــابی   دزی وا کەڵەگــا نــابی
مــیللەت بێکــار و برســییە  نــانی ئــیلڵا یێــی نیــیە

وا نــابی شــوانی وا نــابی  دەبــی عەدالەت بەپــا بــی
دەنــا گەل لــێ و قەبــووڵ ناکــا   ڕاپــەڕینێ ئەنجــام دەدا

وا نـابی شـوانی وا نـابی   مەڕ لە گـورگ و سـەگ چـا نـابی
حەمــام بە تــڕان گەرم نــابی  ســەرکردە دەبــی دانــابی

هەولێر ٢٠١٦/٩/٢٠

## دەبێ کەی ئێمە تەمبێ بین؟

بە فرچکــی زوڕنــای حیزبــی پڕۆپاگەنــدەچیانی نــۆکەر!
میللەتیــان پــڕ لە کیــنە کــرد پەنــا نەمــا بــۆ قــوڕ بەســەر!

ڕاپەڕیــن بــۆ هەنــدێ نەبــوو خەڵکێــک بکەیــن بە دیکتــاتۆر
شۆڕشمان بۆتاقمێ نەبوو خوێنمان بمژن وەک مشــەخۆر!

بــۆچی حیزبــی فیشــاڵچی وا بە غەدر و تــاڵان، براکــوژی
ڕاپەڕیــــنمان لــێ زەوتــــکەن ؟ نەهــێلن گەل ئــازاد بــژی؟

بە کــوردێنی ســاختە و گــزی هێــز و وزەی گەلیــان دزی
خۆیــان پێکــردە ملیــاردێر گەوج و کۆیلەیــان پــێ کــڕی

دەیان دەمامکیان لە سەرنا خۆیان بە چەنــدین بــار گــۆڕی
سەری گەلیان لە قوڕینا، مــاین بەدڵســاردی و سەرشــۆڕی!

ئای چەندسافیلکەو کورتبین بووین قــەڕنێ لەخشتەیان بردین
نیو سەدە درۆیان بۆ کردین بەکوشتیان داین تێنەگەشتین!

دەبێ کەی ئــێمە تەمبــێ بــین؟ بە خۆمــان بۆخۆمــان بــژین
پاشکۆی دینی، دیوەخانی سەرۆک خێــڵ و ئاغــان نەبــین

وەک زوڵــم لێکــرای یەکبگــرین! ئەوەنــدە خۆشــباوەڕنەبین
بەرە و پیری زانست بچــین کلکــی درۆزنــەکان ببەســتین!

هەولێر ٢٠١٦/١٠/٣٠

# بەڵێنی عاشقانە

هەر چەند لە ڕەنگی چاوانی یار دەڕوانم دەحەپەسێم!
بەخەیاڵی عەشقی جوانێ لە ژوانێ، بە شیعر دەدوێم

بێ برژێیە حەزی کپ بووی هەڵەتەچووی سەرخەرمانم
بەڵکو هەتوانیکەی دەردی تەشەنە بووی بێ دەرمانم

سارێژکەی دڵی عەوداڵم لە بیرم بەی خەمەکانم
بە ئاوڕێکت دامرکێنی ژانی هەڵچووی زامەکانم

شیرین گیان تۆ پەری خەونی شەکەتی عومری پیریمی
تۆ ئەڤینی دڵی تەڕی پڕ سۆزی تەژی ژیریمی

زوو بمگەیێ و ڕزگارم کە لە پەژموردەیی و تەنیایی
گفتێکی عاشقانەم دەرێ بمبەوە ڕۆخی تەناهی

هەولێر - ئازاری ٢٠١٤

## حوکمداری دروست بەرپرسیارییە

"کۆمێنتێکمبوو لەسەر پۆستی هاوڕێیەکی فەیس"

وارێـــــم ئەوانە ویژدانیـــــان نیـــــیە
گەلیـــان بـــۆ چەپـــڵە و کـــۆیلایەتییە

دوژمـــنە هەرکێـــی باســـی مـــاف بکـــا
فەرمـــانبەر کێـــیە؟ تەقاویـــت چیـــیە؟

پووڵ هەر شایستەی شێخ کوڕی شێخە
خەڵکیان بۆ پێچکەی کورسی پێ مێخە!

دەک شـــەرمەزاربێ لەڕووی مەحشـــەرا
کـــێ خەڵکـــی لەلا کورتـــانی کەرە!

حوکمـــداری دروســـت بەر پرســـیارییە
کەی تـــاڵانچێتی مـــاڵی گشـــتییە؟

هەر کـــێ خزمەتـــی میللەتـــی نەکـــات
خـــوایە هەرگیـــز بـــە مەرامـــی نەگـــات

هەولێر ٢٠١٦/٢/٢٩

## عەقڵی زیندوو

### ١- عەقڵ

کێ کاری ئاسان ڕایی بێ
بە زوویی لەخۆی بایی بێ
عەقڵیشی زوو ژەنگ هەڵدێنێ
داهێنانی پێ نامێنێ

### ٢- فێربوون

ئەوەی کتێبان نەخوێنێتەوە
نەمامی نوێ لەجێی پیرە
داری مردوو نەچێنێتەوە
لە ژیانی خەڵکی فێر نەبێ
قەت بە خۆی دا نەچێتەوە!
هەرپاشکەوتوو دەمێنێتەوە
لە زینگەکی ژەهراوی دا
بە تەنها خۆی دەبینێتەوە!
هەرکۆنە کا کاوێژ دەکا
یاسینی مەرگ دەڵێتەوە

### ٣- داری بەرهەم

ئەو دارەی کە بەرهەم دارە
خێری بۆ گەلی هەژارە
ئەوەی دڵی پڕ کینە بێ
عەقڵی دروستی، چۆن پێ دەبێ؟

### ٤- شاعیر

گەر شاعیرێ خۆی نەناسێ
با دەست داتە بێڵ و داسێ!

قەڵەمەکەی تووڕ هەڵ بدا
بفرۆشێ کوارگ و ڕێواسێ!

٥- مامۆستا

مامۆستا گەر بێ زانست بێ
یان ڕووی گرژ و تووڕە و پەست بێ
بە پەروەردکار نا ژمێردرێ
با بۆ کاری تر بنێردرێ!

٦- سەرکردە

(حەمە شێت ) زۆر جاران دەیگۆ
گەر شوانیت پێ ناکرێ بڕۆ!
سەرکردەیەک گەل نەیەوێ
خەڵک پێی بڵێ لاچۆ لەوێ
دەست بە پێچکەی کورسی بگرێ
لامل بێ هەر پێ دابگرێ

یان بە مەراق خەڵکی دەمرێ!
یان بە شەقی گەل لا دەبرێ!

٧- سیاسەتوان

تا سیاسەتوان بازرگان بێ
حوکمەت وا بۆگەل نەبان بێ
دەبێ خەڵک هەر برسی نان بێ
بندەستی تورکیا و ئێران بێ

٨- زانستی خۆشەویستی

گـۆشـت بـۆ قەسـاب، نـان بـۆ نـانـپـێـژ
لـەگـەڵ بـەرد نـاکـرێـت وتـوو وێـژ
بـە زانـسـتـی عـەقـڵـی زیـنـدوو
خـۆشـەویـسـتـی دەبـێ بـەخـوو

هەولێر ٢٠١٧/٣/١٥

## نوقمی تەماشا

گوتبـووت بـۆچی تـۆ نـوقمی سـەیر و تەماشـایی منـی
بۆ وا ڕووچووی کە هیچ چاوت لە ئاستمدا نـاترووکێنی؟
چاوم ناترووکێنم تـا تـۆ لە نێـو دەستمـدای، دەرنەچـی
چـون چاوەکانـت بە قـەدەر چـاو تروکـانێکە نـازی!
٢٠١٧

لە فارسیەوە

# بێزاخ *

"ئەم چەند دێرە تەنزەم لەبەر بێ نەفتی وناگزوری خەڵکی نووسیوە".

کەر لە کــوێ کەوتــووە، کونــدەی ئــاوێ لە کێنــدەرێ دڕاوە؟

خەڵکی کوێی دێشێ؟ کـوێی تـیمار دەکـرێ؟ سـەرم سـوڕماوە؟

بـێــزاخ بــە کـــەرێ نــاوێـــرێ، تـــاو دەداتـــــە کورتـــانـــی

ئــاش بــێ باراشــە و بەرمـیلمان لە سـڕەی بــەلاش قۆپــــــاوە!

هەولێر بێ نەفتـــە لە سەرمـــان ! کـەوتۆتـــە ژێــر بە تــانــی

فوول مەعاش و چەوورەی★ جاشیش! هەڵـدەپەڕن بەهەرزانـی!

هەولێر ٢٠١٦/١٢/١٠

★بێزاخ : بێ غیرەت

★چەورە:نەوسن و تێرنەخۆرە

## بڕواناکەم لەبیرم کەی

کە تـۆم لە تەک نەبـێ چـیم لە جەژن و شـادی داوە ئەی یـار

بەوە مـاوم کە شـێوەکەت دێـتە پـێش چـاوم جـار و بـار

دەنـا هەر زوخـاو دەچێـژم دڵ زامـدار و بـێ قەرارە

بـێ تـۆ گیـان هەڵ پڕووکـاوم لام چـۆڵ و هـۆلە ئەم شـارە

چەنـد لە مێـژە هەر چـاوەڕێم لە جەژنێکـا سـەرم لێـدەی

دەزانـم تـۆش بـێ مـن هەرگیـز بە کـامی دڵ نـاڵێی ئـۆخەی

ڕەنگبێ لەولاش خۆت وادەرخەی کە بێ من خۆش بەسەردەبەی

بـڕوا نـاکەم! تـۆش پێـت بکـرێ سـوک و سـانا لە بیـرم کەی!

٢٠١٧/٦/٢٦

## ئەستێرەی درەوشاوە

" بۆ کیژەکوردێکی سنەیی"

ئەو ئەسـتێرە درەوشـاوەیە لە ڕەچەڵەکـی ئـارییە

بـۆیە وا جـوان و ڕەنگیـنە لە سـنەدا چەشـنی نیـیە

جوانێ ئاوا لەگوڵ جـوانتر، جوانـاوی کـانگەی خـواییە

نـزای سـەرفرازی بـۆ دەکەم پـاکیزەی ڕۆژهەلاتیـیە

٢٠١٧

## مردم لەداخی جاسووسی

**ئەو شیعرە لەداخی درۆی شاخداری هەندێ میدیاکارو بێمووچەیی نووسراوە**

گەر چیرۆکــی دەردەســەری ژینــی خــۆم بــێ کەم و کــوڕی
بنووســیباوە دەمنووســی مــردم لە داخــی جاسووســی

لەداخ ڕوو قــایم و مەعــلان لە کــاری بەدی و چاپلوســی
ئەو کارخانچیــانەی قەت جێیــان نەدەبــووەوە لە قاموســی

لەبەزمــی پــوولەکی و درۆزن دەڕشــێنەوە، لە میــدیاکان
ســوڕ دەزانــن کــێن کە دزن ؟ پچــڕام بەداخــی پینەچییــان!

لە دەســت چەلــوملی بەلآ! گەلیــان کــردووە بە قیرِوســیا
بە پــێش دەرکە و بەدەســکەلا !بــە ژێــر چەپــۆک، هەلا هەلا

بەچەقــۆی کــول گەل ســەردەبڕن! وەک کەر و گــا تێیــان دەخــوڕن
وەک ســەگیش پێیــان دەوەڕن لە ســەر ورگیــان هەڵــدەپەڕن!

ئاغــا بــە تیــژی تێپــەڕی نەفتــیش قووتــدراوە بــە بــۆڕی!
تلــی لیلــی ! مــووچە فــڕی ! خەڵکــیش بــا چــاوی دەرپەڕی!

٢٠١٦/١٢/٥

# مەتەڵ

مەتەڵێک هەیە کێ هەڵی دێنێ؟ چ دبێژی بێژە!
بۆخۆت هەڵپەڕە! یاخود ڕاپەڕەو قامچی بچێژە!
خۆی تێرو پڕە، بەشەوو بەڕۆژ خەریکی چێژە!
گەل زۆر ئازادە ! لەکونی ژووری! تێر بقووقێنێ!
بۆی هەیە جار جار بەرد بهاوێژێ و شووشە بشکێنێ
خەڵکی نەدارە و سەر لێشێواوە و گەوجێندراوە
بێ مووچە و کارە و وەک مەڕی گێژە! هەر تێی خوڕاوە

حوکمدارێکی گێڕ و بەزەڕە
یان بێ خەبەرە، بێ هەست و کەڕە
خۆی دەخافڵێنێ، خەریک کاوێژە!
کاووجۆی زۆرە ! وا دەفیشکێنێ!
گەل بێ مەفەرە، زۆر بە دەست نوێژە!
ڕەق هەڵگەڕاوە، بێچارو گێژە

مەتەڵێ بێژە!

جام پڕە و هیچی لێ نارژێ چون لە عەقل بەدەرە
پڕ لەقرێژە!
کێ بندیوارە ؟ کێ فیتنەسازە ؟ کێ بارەبەرە؟
کێ هاو ئاخوڕە، کێ هاو ئامرازە؟ خەبەرێ بێژە!

کێ   گەندەخۆرە ؟کوێ پڕ لەغازە ؟ ؟ کوێ سـەرهەورازە؟

کێنـــدەرێ چەورە و یەکجاربەربـــادە؟ کێنـــدەرێ لێـــژە؟

هەر هەڕەو وەڕە، بـــێ هەســـت و کەڕە، مەتەڵـــێ بێـــژە!

دیـوی خـانەکەی ! پـڕکەڵلەی بـۆش و کـۆیلەی منجـڕە!

تێوەی گڵاون !شێت وشەیدای بوون  !پێـوەی نووسـاون!

خەڵکیش چاش مـاون ! ناچـار خەریکـی خەیـاڵ پـڵاون!

هەر زەڕە زەڕی   جاشـــکی بەزەڕە، خەریکـــی شـــەڕە

زوو کەن دەربێـنن  لە ژێریـان  بەڕە و ئەسـکەملە شـڕە!

دەنـا تـا مـاون، بەو کەســەرەوە  هەر لەخـۆ هەڵـدەن!

زوو بە ئاگـا نـێن! دەنـاڵن تـاهەن، هەرکـۆیلە و بەنـدەن!

٢٠١٦/١١/٢٠

# پاشەوپاش



بیست وپێنج ساڵ ڕەتی دایە  کەچی حوکمەت هەر ساوایە
خەڵکی نووستووە و لەگوێی گایە!  دۆش داماو بێ کارەبایە

بە فانۆس و پڵیتە و چرا   پاشەوپاش لێخورە !بچۆ ئاش
کورد شوکرە سەد ماشەڵڵا! دەستنوێژ دەگرێ لە گۆم بەلاش

کوڕی باشن! زوو دەبنە جاش! تێکە و فڕکە دوور لە بەڵا
کڵاو وجامانەت بگرە باش  ملشۆڕکە پاشەڵ بەڕەڵلا

قارداش و جاش دەبنە یۆڵداش!  پێشمەرگەش دەچتە بن تەڕاش!
کوڕە مەسولیش لێدا تەناش!  ئەو بکا بەجاش خۆی بکا بەباش!

خەڵکی بکوژێ لەسەررەماش!  گەل نەیبێ بخوات تەرەماش!
نە کارماوە نە بزنی قەش!  نە مووچەی قەبەو نەوتی ڕەش

خۆشە ژیان بە کۆیلەیی !  لە دۆمینەش بمرێ دوو شەش!
لە دامەش هەر دابمێنی!  پێکەی سیگاری قونک ڕەش!

کڵاوەکەت بگرە با نەیبا  هێواش هێواش بڕۆ وە پاش
هەی تێهەڵدرای بێ سەروپا  بەنوێژی نیوەرۆ شەوباش!

هەولێر ٢٠١٦/١١/٢٦

## بەسیە کوردێنی کەرترێن!

"٢٠١٦ لەداخ برسی کردنی خەڵکی وبێباکی دەسەڵات نووسیومە"

هـــاوڵاتی وەک مەڕومـــاڵات بەچەنـــدین قـــات، دادەدۆشـــن!
نـــازانم ئێـــوە بـــێ هۆشـــن ؟ یـــان تینـــووی خـــوێنن نەخۆشـــن؟

تەنیـــا بـــۆ مـــانەوەی کورســـی شـــڕی خۆتـــان تێدەکۆشـــن
چیتـــان بـــردووە وخـــواردووە؟ ســـندانی کەن، حەپەلووشـــن؟

دە توخـــواکەی لـــێمان گەڕێـــن بەســـیە کـــوردێنی کەرتـــڕێن؟
گەر ئێوە میللەت پـــــــەروەرن لـــە سیاسەت بـــەسەرو بـــەرن!

شەرەفی خەڵک هەڕاج مەکەن خوێنی پێ میـــم فیرۆ مەدەن
ئەو جوانیـــانەی هێشـــتا مـــاون بەرچڵپـــاوی خۆتـــان مەدەن!
کە حـــــوکمەتی و پێنـــــاکرێ یەخەی گەلـــــی هەژار بەردەن

بە پـــارەی نەوتـــی ئەم خـــاکە وا لە خۆبـــایی وبـــێ هۆشـــن
بە سانـــــایی ئـــەم وڵاتـــــە و ئێـــمـــەش بـــە دوژمـــن دەفرۆشـــن
بـــا کـــار لە کـــاران نەتـــرازێ چیـــدی گەلمـــان دامەدۆشـــن
بێگومـــان لـــێمان تێنـــاگەن! دەڵێـــی هەمیشـــە سەرخۆشـــن

دیــاره دابــڕاون لەم خەڵــکە  تینــووی کورســـی و زێــڕ و پــارەن
هەند چڵێس و هەمەکارەن! بۆ یـــەک "کــۆمەل "دوو ئیـــدارەن!
هــەند زیــانبــەخش و بــۆگــەنیــون
ڤایــرۆس گشت جەستەی تەنیــون

هەولێر ٢٠١٦

## تەپڵی شەڕێ

تەپڵی شەڕێ، بەخوێنی کوڕی هەژاران  لێدەدەن!
بۆ مانەوەشیان سەریان بۆ  ناو گەلانی  خۆیان دەبەن!

# جوێندان نەنگییە

هـۆ کـوردینە ئەی مەردیـنە  پیـر و گەنـج و جەوانیـنە
هەرچـیەکن .زەردن کەسکن.سـەربەخۆن یـاخۆحیزبینە
نەنگیـیە بـۆ کـورد جوێنـدان و فیتـنە قـازانجی دوژمـنە
یەکبگـرن ئیـدی بەسـیەتی  ئەوە تکـاو  داوای مـنە!
کەی ئەوهـایە کـوردایەتی و شۆڕشـگێڕی و مەردایەتـی ؟
ئەگەر ڕەخنەیەکتـان هەبـوو  لە هەواڵـێ یـان پرسـیارێ؟
لە ئـێش و دەردی هەژارێ  یـان لە فیشـاڵی زۆرداریێ
بەزمانێکی جوان و شیریـن   بڵـێن قوربـان دەتـان بینـین
ڕۆژێ دادێ لەدادگـای گەل  بەسـەرتانا بقیـژێنین!
جـا ئەودەمە شـەرمەزارو  ڕیسـوان دەبـن، دەبـنە گەمە
مێـژوو ڕوحـم بەکەس ناکـا  پـارەو پـوول دادی کەس نـادا
هەندێ مافی خۆی وەردەگرێ و پێدەکەنێ، لەو سـەردەمە
هەندێکیش بەنەفرەت دەکرێ و دەگریێ و دەبتە سـینەمە!

٢٠١٧

## وەرە زگی خۆت مەدڕە!

گەپ:

حوکمڕانێـــکی ڕابوێـــرە بـــە خـــەڵکی
گەل چاشـماوە دەسـتی ناگـات بە سـەلکی!
لە گەڵ بەغـــدا هەڵ ناکـــات، نەوت دەخـــوا
هـی خۆمـاڵیش حەپەلـووش دەکـات بەخـوا !
ســـەر بەخۆچییـــیش! بە تەمـــای تورکیـــایە
کە دوژمنـی سـەر سـەختی قەنـدیل، چیـایە
وەرە زگـــی خـــۆت لـــە داخ کۆیـــلە مـــەدڕە
ڕاپۆرتنـــووس و جاسووسـێکی سـم خـــڕە!
ڕووت و بـــــرسی، دەوەڕێ وەک ســـەی دڕە
جاش میدیاچییش چەواشـەچی و دەنـگ زڕە
حیـزب پـڕە و خـــەڵکیش بـــرسی و بێـــچارە
دەسەڵاتیـــش لـــە بـــان هەژارە، غـــــەدارە!

ئاداری ٢٠١٧

## مەرد جارێ دەمرێ

بۆچی زوڵم قەبووڵ بکەین کەسی مەرد هەرجارێ دەمرێ
"حیزی هەمبانەی لۆکەیە "چەندی تێیکەی هەر دەیگرێ!

٢٠١٧

## شیعر نووسی لە خۆ بایی

"لەگەڵ ڕێزم لۆ شاعیرە خاکی و داهێنەرەکان، خۆ بەشاعیرزان
گەلەک زۆربـوونە، بەداخەوە کەس کەس نـاخوێنێتەوەو چـاک و خـراپ
تێکەڵاوبووە"

هەنـــدێ شیعرنووســـی بـــوغڕا زوو دەکەونە هەلەکە ســـەما
بەچەنـد شـیعرێک بـێ سـەرو بـا بە جـۆ نـادەن دەڵـێن گەنمە!

بە فیـزن، لە خـۆ دەرچـوونە بە سـەر کێـوی قـاف کەوتـوونە!
وا دەزانـــن بەرەو ئەوجـــی بـــورجی داهێـــنەری چـــوونە

وا دەزانـــن هێنـــدە بەرزن لە بەر بەفـــر و تـــۆف نـــالەرزن!
بەڵام هەیهـوو کەی تێـدەگەن؟ بەمەغـــرووری بە هـــیچ نـــاگەن

گەر پۆست و مۆستیش وەربگرن دەست بە کلکی مافیـاش بگـرن
نـاو بـانگی سـاختەش پەیـدا کەن لە دەربـاری مـیر و بـەگان!

ســـواڵ بـــکەن و جـــێگە ڕاخەن ببـــنە ڕاویژکـــاری نـــادان
داهاتوویـــان هەر نارۆونـــە ماســـتاوە شـــیعری دژوونە!

هەر بە شــەوقی مــانگە شــەوێ  ســیحری درۆییــنە دەردەکەوێ!
چەند پشتگیریان بێ دەسەڵات   مایکیان بۆ بگـرێ و هانیانــدات

پــاقڕ هەرگیــز نابێــت بە زێــڕ   شــتی ڕاســت ناپێورێــت بە گێــڕ
زۆری بۆر و ناوبانگی بۆش  خەڵکــی ژێـر پێـی نـابێ ســەرخۆش

هەرچــی لە ڕێــی گەل دا نەبـوو   ڕەنجــی ســەد ســاڵی بەبــاچوو
هەبوونەبــــوو، نەبــــوو هەبــــوو!  لە زۆردار درۆزن تــــر نەبــــوو!

چ ئێســتا یــا خــود ســەر لەزوو  خەڵکێکــی مــایە پــووچ هەبــوو
شــاعیری لنگــاو قــووچ هەبـوو  خــۆ دەرخەری هــیچ تــێ نەبـوو

لە خــزمەت میللەتــێ نەبــوو  دەســتی لە بــن جەواڵ دەرچــوو
تــاوەکو نەینــێن لە تــەبــەق    قەت نــاڵێن ئەڵڵاهــو ســەددەق!

خۆشــم شــیعر نووســم بەڵام   تــڕ زلــی ژێــر کەوتــنە لام!
لە خۆبــایی نــیم و نــابم   چــون کۆتــاییم دێ گەر شــابم

٢٠١٧/١/٢٢

## خۆش خەیاڵ

فەیســـبووک دیســـان ئەو شـــەکرەی شـــکان
پەنجـــا ســـاڵی تـــر دەمێـــنم لە ژیـــان؟
کـــورد خـــۆش خەیـــاڵە نـــادۆڕێنێ قەت!
پاشـــای ســـەرزەوین بـــێ ئـــاڵا و دەوڵەت!

## بۆ ژن لە هەشتی مارس

ژن لەڕۆژ هەڵاتــی نــاوین دەڵـێن چەوســاوەی دەســت پیــاوین
پیاوانیش چەوساوەن ئەی بـۆ چەوسێنەری چەوساوان بـین؟
ئەی ژن ئەی بەرهەمهێنی پیاو هەشتی مارسیش درۆیەکەبـاو!
بـــۆ ڕۆژەکـــانی تـــری ســـاڵ دڵـــت دەکەنە کـــۆی زوخـــاڵ؟
چـــون کۆمەڵگـــای پیـــاو ســـالاری دونیـــا دەبینـــێ بەلاری
دایـــــــک وخوشـــــــکان کیژیـــــــان هـــــــاوژین
ســـــــەرچاوەی ژیـــــــنن هەمـــــــوو ژیـــــــن
کێـــی ژن دەچـــەوسێنێتەوە داری ژێـــر خـــۆی دەبـــڕێتەوە
ژن پێـــوەری پێشـــکەوتنە بـــێ ئـــازادی ژن ژیـــن ونە
لەهەرکوێ ژن لە مەیدان بـێ یەکسـان بـێ و لەکـۆی ژیـان بـێ
عەشـــق و خۆشـــی لەوێ هەیە لەشـــکری ڕق لە دوواوەیە!
تـــا ژن نەگـــات بە یەکســـانی پیـــاویش تـــامی ژیـــان نـــازانی!
ئـــافرەت ئـــازادی خـــۆی نەوێ هەر بە بـــن پێیـــان دەکەوێ!
گەر ژن عەقڵـــی کـــراوە نەبـــێ هەر کـــۆیلە و لە دوواوە دەبـــێ
ئەی ژن ئەی جـونترین بـوونەوەر هەریەکسـانی شـایەنتەهەر

هەشتی مارس ٢٠١٦

## ژاوەژاوی دەوڵەتی درۆ *

"حەفت مانگ پێش ڕیفڕاندۆم"

نەفـــرەت بــێ لەژاوەژاو و قیرەقیــــڕی قەڵەم فرۆشـــان
لەبازرگـــانچی تـــاڵانچی  درۆی ئـــازادی! وڵات دۆشـــان

تــف لە وانەش کە شـــانازی  بە کـــۆیلەیی خۆیـــان دەکەن
کڕنـــۆش بــۆ مەســئولی جەردە و بازرگانـــانی خـــوێن دەبەن!

ســـەری زمـــان وبنـــی زمانییـــان  درۆی دەوڵەتـــی کـــوردییە
وەک ڕۆژی ڕوون لـــێمان دیـــارە  کڵاوەکەیـــان بـــابردییە

قەت پەنـــد لەمێـــژوو وەرنـــاگرن  پیشـــەکەیان گەلـــۆرییە!
تـــاقمێکی دژ بەفەقیـــرن  چاوشـــۆڕی و چڵکـــاوخۆرییە

هەرخەریکی خۆبردنە پێش  گێـل بەگـی و ماســتاوچێتییە!
چەنەبـــازی و قەوچە قەوچیـــان! بـــۆ ئـــالیکی جاشـــێتییە

ئەگەر گەل بڕیـــاری نەبـــێ  کارەســـــاتێک  وا لە ڕێـــــیە
ئەم خوێن بەفیڕۆچوونەمان  لەچـاو ســـەرکاری بـــێ جێـیە!

خەڵـــکە هانـــام هێنـــاوە بۆتـــان  چـــارەیکەن! ئەم دۆخەمـــان
دەنا دیســـان تێهەڵـــدەدرێن! دەکەونە بـــن بەحـــری خەمـــان!

هەولێر ٢٠١٧/٢/٢٨

★ مامۆستا فەتاح خەتاب وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی

## بۆ شەهید یاسین

چـل و نـۆ سـاڵ بەر لە ئەمـڕۆ، یاسـینی بـرام
ئەو مامۆستایـەی زۆر وانـــەی، گرنگی پێـدام
جوانەمەرگبـوو، منـیش داخبـار و تــەنـها مام
بــوومە هــاوڕێی گیـانی گیـانی، خەفەت و وزام

کــاتێ ئەو وەخـــتە شــوومەم بە بیــر دێـــتەوە
دەمارەکــانی خــوێنم گشــت، وێــک دێـــتەوە!
خەیـــــــاڵی ئەو غەدرەم ئەبەد لێنـــــــابتەوە!
کـــوردیش تــا وا خۆخـــۆربێ ناحەســێتەوە

کە تەرمـــی خوێنــاوی تۆمــان، بـــۆ هــاتەوە
خەم بــووە مێــوان، خۆشـیش ڕۆیـی و نەهـاتەوە

بەرواری هەشتی پێنجی ساڵی شەسـت و هەشـت
بــابە و دایەش، فرمێســکی خوێنییــان هەڵڕشـــت

ئـەی شەهیدی جوانەمەرگـــــم، کاکەیاسیـــــن
دوای مەرگی تۆ تووشی شۆک بووین، هەرواکاسین
هەمیشـە وێنــە و یادگاریـــت لـەدڵمایــــــــە
هەمــوو چرپـە وجوولەیـەکم تـۆی تـیـــــایــە

٢٠١٧/٥/٨

## چۆن شیعرێکتان بۆبنووسم

پێنج مانگ پێش ڕیفراندۆم نووسیومە ٢٠١٧/٤/٢١

دەڵـــێن بـــۆچی شـــیعرەکانت ئەوهـــا تـــووڕە و دڵشـــکاون؟
چـــی ڕســـتەی یـــاخی و عـــادزە بـــۆ بەرگـــری هەڵ پێچـــراون؟

دەڵێم چون گەل بەدەست حیزبان لەم خاکە بێ ئومێـد کـراون
قوربانین لە دەسـت کەمێکـی ؛کەم! بـۆ کەمـان !چەوسـێندراون

هەر وەکـــو ئـــاردی نـــاو دڕکـــان زەق زەق بە بـــن پێخـــراون!
یـــان وەک مـــزە گەنـــم و مەعـــاش لـــە بـــن بەرداش، هـــاڕدراون

بـــۆ نـــاکۆکی و پاشـــقۆڵگرتن.... یەکنەگـــرتن .... پـــف هەڵـــماون
پیلانگێـــــڕان! دژ بەرژەوەنــــــدی هەژاران، بەگــــــڕ خــــــراون!

لـــەم خـــاکە پڕ نـــەوت و غـــازو خێـــرو بـــێـــــرە!
بەهـــــــاوڵاتیە ناحیزبییەکـــــــان، دەکەن گێــــــرە!

بە کـــۆیلە و تێـئـــاڵاوەکانی خۆشـــیان هەر دەکەن هێـــرە!
گەل قوربانی گورگی برسی و هرسی چیایی وهەسـپی کـوێرە؟

پیشـــەی حیزبـــی نـــۆکەرێتی و فیشـــاڵ بـــازی و پەت پەتێـنە!
بزنســــمانی بـــێ بەلێـــنە پووڵـــداری نـــا بەرهەم هێـــنە

خەریکـــی پەرت پەرتکـــردنە  نـــاوچەگەری و شارشـــارێنە
بـــرەودان بە جلخـــوارییە !جاشـــێتییەکی دڵ پـــڕووکێنە!

دەپـــــێم بڵـــــێن لە دۆخێکـــــی وا ســــــەقەتا
وشـــەم وەخـــتە ملـــی خـــۆی بکـــا بەپەتـــا!

چـۆن شـیعرێکی مـوژدە دەرتـان  بـۆ بهـۆنمەوە دووبـارە؟
کە دڵـــم وەک زســـتانێکی  ســـارد و ســـڕی بـــێ بەهـــارە

کە گەرووم پـــڕ لە تـــاڵاوە و ســـێ ژەمەشـــم ژەهـــری مـــارە!
چیم لە ڕیفرانـدۆمی ساختەی  سـەری بـێ گوێ و نالەبـارە؟

کەنگرو ماسـت و سـەربەخۆیی !وەختـی ڕاسـت و درۆی دیـارە
ئەرێ شـــیعر هەســـتی پـــاکە ؟ یـــان خزمەتکـــاری غەدارە؟
بەو داخە لە گەڵ خـــاک و شـــیعری ناســـک بـــوویمە غەوارە

من چەنـد باسـی خۆشویسـتنی وڵاتـم کـرد، کەس نەیویسـتم!
چەنـــدەی هـــاوارم لێهەڵســـا بـــۆ دادگەری، کەس نەیبیســـتم!

هاوارم ناگات بە هیچ کـەس، وای غەریب خۆم !هەی هاوارخۆم!
لە بێ عەقڵی و بێ سەری ئەم سەرانەی خۆم ! خەفەت دەخۆم
وا تەنهـام بە دەوری غەشـیمی و نـامۆیی خـۆم خـول دەخـۆم

نـــازانم بەم هەمـــوو دەرد و برینـــانەوە بـــۆ کـــوێ بـــڕۆم؟
چەندی زوو ڕزگاربم لـەم نـا کوردبـوونەی خـۆم !باشـترە بـۆم!

هەولێر ٢٠١٧/٤/٢١

## مانگی تابان

نەرمبــووی وەک ئــاو تێــپەڕی  گەرمبــووی وەک خــۆر دەرپەڕی

لــووس بــووی وەکــو ماســی خــزی   بــە ســانایی دڵمــت دزی

بە تێڕامان، خـۆتێهەڵسووان  سەرسامت بووم ئەی شـۆخی جـوان

حەزم لـــێ بـــوو هەمیشـــە تـــێکەڵاوت بـــم، گـــوڵی باخـــان

لێـت تێـر نـابم، چەنـد ڕاتمووسـم،  بتلاوێـنم، بە دڵ و گیـان

کە تـۆ هـاتی بە ئەسـپایی  ڕوحـی مانـدووی منـت ڕاو کـرد!

هـیچ لە بەر چـاوم لا نـاچی  دڵـی زامـدارمت بەچـاو بـرد!

ئەی ژنـــی خرپنـــی ناســـک   بە نـــاز و فیـــزی وەک ئاســـک

وەکـو بروسـکە هـاتی و ڕۆیـی  تیـژ ڕۆشـتی ناسکۆڵەی خـۆیی

دەبـووا تێـر عەشـقت بنۆشـم  لەوسـاوە بـێ مەی سەرخۆشـم

جـێم مەهـێڵە مـانگی تابـان  عاشـقت بـووم تـا سـەر ئێسـقان

نەکەی یەکجـاری ئـۆغرکەی   دڵـی مانـدووم لە نـاو بـبەی

هـۆ ژنـی ڕەنـگ ئەرخەوانـی   وەک تیـر دەرچـووی لە کەوانـی

زوو وەرەوە  بـــۆ مـــاڵەکەم   بـــێ تـــۆ شـــێواوە حـــاڵەکەم!

هەولێر تەمووز ٢٠١٧

## بۆ دایکی جەرگ سووتاوم

بـۆ یـادی مەرگـی تـۆ دایە چـی وشـەی لەهەگـبەم دایە
نـاکاتە دڵۆپـە شیرێـکی لـە مەمـکت بـە منـت دایـە
دەستەوەسـتان و دامـاوم کـوا وەسـفت لە توانـام دایە؟
ژینت هەرگریان وشین بـوو، بـۆ هەردوو ڕۆڵەی شـەهیدت
بۆ یاسـینی جـوانەمەرگ و جەمیـل ڕەنجـبەری عەگیـدت
دایـە بمبـووره نـاتـوانم، شیعـرێـکت بـۆ بهـۆنـمـەوە
لە مێـژە بە تـەمام بـاسی گـەورەیی تـۆ بنـووسمـەوە
چی دەنـووسم دەیسڕمـەوە
تـۆ زۆر لـەوە پیـرۆز تـری بـەم شێـوە بتـلاوێنـمەوە
بـۆیـە بێشـک ئـەم وشانـەم
شەرمەزارن کاتێ باسی ئاسکی دڵ بریندار دەکەم
سی وپێنج ساڵە جێت هێشتووم
لـەوساوە مـن هەتیـو کەوتـووم
بە مەرگی حاجی ساڵحی باوکم وا سەرگەردان نەبووم
هەرچەند بەویش پشتم شکا
کەچی بە مەرگی تۆ شۆک بووم ژیانم تروسکایی تییا نەما
فریشتەی شیعرم جێی هێشتم
هەست وخوستی لا نەهێشتم

دایـەی نوقمی ماتەمینـم  بە چ زمانێـک  بتـدوێنـم؟

تۆی سەرچاوەی جوولەو هێزم  دڵی پڕ ئەویـن و سۆزم

تـا مابم وەک سووتانەکەت! دڵ هەڵقرچـاو و غەمگینـم

ئازاری زۆرت دیت قوربان  ئێمەت بـە باشی پێگەیـان

چرکەیەک لە یادم ناچی  لای من تۆی هەموو نیشتمان

تۆ بوویتە قوربان خاکێکی  ژێر چەپۆک و بێ ناونیشان

هەولێر ٢٠١٧/٢/٢٢

دایکم لە ١٩٨٢/١/١٣ کۆچی ئەبەدی کرد.

## هەولێرییەکان بۆ بێدەنگن؟*

"بۆ٢٦ یادی ڕاپەڕینی یازدەی ئازاری ٩١ ی هەولێرەکەم"

بە داخم بۆت هەولێرەکەم عەیامێکە ئەتک دەکرێی
بۆ ئێمە بووی بە کانگەی خەم لە گشت لا گەمارۆ دەدرێی
ناڕەواییت دەرهەق دەکەن هەرکێی دێتن بەڕاست وچەپ
بازرگانیت پێوەدەکات، دەتکات بە مەزاق گاڵتە و گەپ!
غەمگینم بۆ مێژووی کۆنت بە سەقەتی نیشان دەدرێ
دەست بۆ بەها جوانەکانت سەروەرییەکانت دەبردرێ
هەر ڕۆژێک کە تێدەپەڕێ لاپەڕەی مێژووەکت دەدڕێ
نا هەقیەکی دژوار تر، قێزەونترت، لە ئاست دەکرێ!
تۆ هەر هەولێری ئازار و ڕاپەڕینی نەوەت و یەکی
شارەکەی جەمیل ڕەنجبەر ومەعروف و جەمال حەیدەری
یوسفەکەی دەرگەڵەیی و شەهید بەهرام، خەجەباوەی
زۆری دی لەم جۆرە ناوەی قوربانیدەر و چەوساوەی

ڕەنجبەر لە کوێی؟ پێمان بڵێ بۆ بێدەنگ و کش و ماتی؟
مودەتێکە چاوەڕێتین درەنگ داهات، هەر نەهاتی؟
هۆ سونبولی خۆڕاگری و بەرخودانە بێ وێنەکەم
کوا کەینێ دێی؟ هۆ هاوڕێیە شیرینەکەم، هەردەبێ بێی!

تەکان بدە، ڕۆڵەی شارە خەمگینەکەم، تۆ بۆ نایێی؟
زوو گۆڕەکەت هەڵتەکێنە! بە هێوری سەر دەربێنە
جەماوەری هەولێرە ئازاردراوەکەی خۆت بدوێنە
ئەم هەولێرە دڵ شکاوەی ئازادییەکەی زەفتکراوە
هەرچی سامانی سەر زەوی و ژێر زەوییە و نەوتی خاوە
هەوای ئاسمان و هەتاوە
بە دەست هەندێ، چاوچنۆک و تێر نەخۆران قۆرخکراوە
قەلاشی چەندین دالاشی دڕ هێرشی بۆ هێناوە

هەموو ڕۆژێ بەم هەولێرە
دەڵێن دەنگی نا دلێرە
بە دەست خەڵکی بێ بەزەیی شار گەلەکۆمەی لێدەکرێ
"پێی دەگوترێ :هەولێرییەکان بێ هەڵوێستن!
گەلۆر، غەریب حاڵ، دەمچەفتن!
زووبن حەوسەڵەم نەماوە وەک جاران یەکبن و هەستن
بڵێن هەرگیز بە ڕیسوایی ژیان ناکەین
ئازادیمان شەرەفمانە پشتگوێی ناخەین
بێدەنگ نابین دەیسەلمێنین هەولێر هۆلاکۆ بەزێنە
ڕێ بەهەڵلووشینی نادەین هەمیشە ناکەس تەزێنە!

## کڕنۆش بۆ بێدادی نابەین

مرۆڤی مەرد لە ژینی خۆی دا مردن یەکجاران دەیگاتێ
ترسنۆکیش سەد جار دەمرێ لە هەر دەقیقە و سەعاتێ
نابێ هیچ کەس لەهەرکوێ بێ؟ هەر ناوێکی لەخۆی نابێ؟
بۆ مەرامی تایبەتی خۆی پایتەختەکەم بڕەتێنێ!
ڕێگا نادەین کۆیلە و دەستە پاچەبکرێ
هاوڵاتیانی بتۆقێنێ

## ڕەنجبەرەکەم

زوو کە وەرە سەر منارەی هەولێرەکەم
بانگی ئازادی ڕادێرە بڕا دلێرەکەم
هاوڵاتیانی ئێرە و خەڵکی گشت سەریان لەوە سوڕماوە
دەڵێن بۆچی هەولێرییەکان وا بێ دەنگن ؟چی قەوماوە؟
پێیان بڵێ هەولێر شێرە هەر دەم بە سەرکەوتن فێرە!
ئەگینا سووک و بێسەنگن هەرچی هەن کاس و بێدەنگن!

مەهێلن کەس تانە و تەشەرتان لێبدا
جوانی و مەردایەتیتان بە تاڵان ببا!
بەرەڵڵایی و بێ یاسایی لەم شارەتان بەرپا بکا
مێژووی پڕشنگدارتان بەرەو شەرمەزاری و گومان ببا

## رەنجبەرەكەی كوردان لەكوێی ؟

بە خـانزادی سـۆران بڵێـی خـاتوونەكەم تـۆ كەینـێ دێـی؟

هەردەبـێ بێـی! هەولێرەكـەت لە گیانـەڵایە و ڕۆڕۆیە!

كـاكە ئـازا و بـوێرەكەم شـێری نووسـتووی ئەو دەڤەرەم

گەلێـك پێویسـتمان بە تـۆیە هەولێـرەكەم چاوەڕێتـە!

بـۆ ئـازادی و ڕاپەڕیـن و دادپـەروەری، كارمـان پێتـە

وەك هەمیشـە پـێمان بـڵێ كـێ زەلیلـی بـوێ شێتـە

توخـوا بەسـیە بێـدەنگ مەبە چیـتر مەبە بە مـایەی زەم

پەشـیمانی دادتـان نـادا بڵـێ مـن هەولێـریمە و هـەم

هەولێر ٢٠١٧/٣/١١

★مامۆستا فەتاح خەتاب وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی

# وڕێنەی سەر پردێ

(دوای پێدانی خزمەتگوزاری ئاو و کارەباو... بەکۆمپانیای ئەهلی)

ئەوین:

پارەی زبڵی بدەن وەک شێر ملتان شۆڕکەن! سەر بەرەوژێر
لە بن پردێ وەرنە بەر بێر! سڕەی بگرن بۆ دان وەک مێر!
با کارەبا نرخی گران بێ لەدەست خەڵکی بێ ویژدان بێ
فەرمانبەر برسی و بێ نان بێ نیو مووچەی پێ مووچەدان بێ
کەرتی تەندروستیش وێران بێ پەروەردەش هەر دەردو ژان بێ
بنوون تێر، بیست وچوار کاژێر زەلیل زەلیل چاو بەرە ژێر!
باجی پردانە و کوردانە! بدەن، دانێکی مەردانە!
سەرتان پێ شۆڕ نەکەنەوە ! لە سەر پردێ مەپەڕنەوە
با مۆرتان پێوەنێن بۆ خێر! نەکەن بژین مەرد و بوێر!
قەڵەباڵغ بوو سەر پردێ ڕێگر زیاد کەن، دەست و بردێ!
خەڵک گوناحە با درەنگ دانێ بچنە ماڵێ بۆ ناو ڕانێ!
کێ خەمی خەڵکی لەبەر بێ دەبێ لە وڵات دەر بەدەر بێ!
گەلی بێ هەڵوێست و سەرشۆڕ! شایەن زیندانە نەک بەرخۆر!
کێی ژینی سەرفرازی بوێ دەبێ ڕاپەڕێ نەک بنوێ
گەر تەمات بێ خوا بۆت چاکا بەفر لە بیابان داناکا!

هەوڵێ بدەن بێنە مەیدان  بڵێن ؛نا بۆ کۆیلەیی ژیان

نا بۆچەوسانەوە و دیلی  نا بۆ ژێردەستی و زەلیلی!

دەبێ عەدالەت بەر پا بێ  ئازادی فەرمانڕەوا بێ

دەنا چارەنووستان ڕەشە  زوڵمی خۆییش وەک گای قەشە

هەر کێی پیسفەرمانڕەوایە، دۆخی ئەو های لا ڕەوایە!

ئەگەر ئێوە خۆش داکەنن! جەردەش بە جۆش پێدەکەنن

دیکتاتۆری ملهوڕ، حیزبی! پێی خۆشەخەڵک پێویست، حیزبی!

ئەوەی دەیڵێم وڕێنەیە  لە داخ غەدری بێ وێنەیە

هەولێر ٢٠١٧/٣/٢٨

# لە ساڵیادی مەرگی باوکم

## ١

هۆ باوکەگیان

دەرهەق بە قوربانیەکانت زمانم لاڵە

وەسفی هەڵوێست، نەبەردی تۆم، پێ مەحاڵە

ئەی باوکەگیان

هۆسومبول وئولگۆی باوکی خۆڕاگری ڕۆڵەی مەیدان

کە زایەڵە و گڕی شۆڕش ورده ورده کوژایەوە

ئومێد لە دڵتا کز دەبوو وەکو شەختە دەتوایەوە

بیست وحەوت ساڵی پێش ئێستا دڵی تۆش لە لێدان وەستا

لە شانزەی پێنجی نەوەتا لە تەمەنی حەفتاو حەفتا

لە سپێدەکی کش و ماتا بەجێت هێشتین بێ ماڵئاوا

لەوساکەوە، من هەر خەمبار و دڵگرانم

چی ئۆقرە و تەناهی هەیە، پێی نازانم

چیت بۆ باسکەم؟ دوای تۆ ئێمەچیمان لێهات؟

وڵات یەکپارچە بوو بەگرو ڕاپەڕین هات

پاشان ئەفسووس براکوژیشی بەدوا داهات!

چیت بۆباسکەم؟

باشبوو نەتدی حوکمی نالەباری کوردی

دەنا ڕەنگبوو پەنجەکانی خۆت بکرۆژی!

نابمبووره تۆ هەرگیز تەسلیم نەدەبووی

کوڕی ڕۆژی تەنگانە بووی

دەچوویـــــەوە بەگـــژ بەفیـــڕۆ دەرانـــی

خـــوێنی گەشــی شـــەهیدانت زۆر بەڕوونـــی

لـــێگەڕێ بـــا چیـــتر برینـــت نەکـــولێنمەوە

دایەئاســـــک و فرمێسکـــــە نەبـــــڕاوەکانی

ســینگ کوتــانی پرســەت بەبیــر نەهێــنمەوە

دەنـا ڕەنگبـێ گەر دووبـارە ژینـت بـۆ بگەڕێنـنەوە

تەمەنـای مـردن بکەیـت و سـاتێ لێـرە نەمێنـنەوە!

گەورەم باوکە خۆڕاگرەکەم

غەریبی قوربانی دان و

ورە و هەڵوێســـتە شێلگیریەکانـــت دەکـــەم

تۆهەنـدەی بـۆ گەل و نیشـتمان مانـدوو بـووی

نیـو هەنـدە بەدوای ئـارەزووی خۆتـدا نەچـووی

گەورەم باوکە

دوکانەکەی ناوبازاڕت لە بۆ شۆڕش بوو بووە مۆڵگە

خۆشت ببووی بەپەناگە

ماڵەکەشت ببووە مەڵبەند، مەکۆ و ئومێدی پێشـمەرگە

بـــاوکە بیـــرمە کە کـــاکە یاسینـــت شەهیدبـــوو

رق ئەستوورتر بووی نەڕووخای
هەرکەجەمیل ڕەنجبەرەکەت
خۆی قوربانی چەوساوان کرد، تۆ نەچەمای
کاتێ ئاسکی جەرگ سووتاوت
هانای بۆبەرخواو مەرگ برد
دەت نرکاند وەک تەنوور ئاگرت لێ هەڵساو بەکوڵ گریای!
دایکی جەمیل ڕەنجبەرم ڕۆ یاسینی تازە لاوم ڕۆ
کەکاک ئیسماعیل[2] بەداخی سەگۆڵەوە
جەڵتەی لێداو بە جێی هێڵای
پیری و خەم هەر دوو هێرشیان لە بۆ هێنای
باوکە غەریبی مەسەلە پڕ حیکمەتەکانت دەکەم
بیری ڕەوانبێژی و پەندە پڕ عیبرەتەکانت دەکەم
باوکە جەرگ براوەکەم
حاجی ساڵحەکەی شانازی بۆناوەکەم
خۆزگە ئەو هۆشەم لا دەبوو
گشت مەسەل و هەڵوێستەکانتم دەنووسی
حیسابگری ساڵ و مانگ و ڕۆژی کوردی
زاینی و شەمسی و قەمەری درشت و وردی
"باوکم وبزووتنەوەی جوتیارانی دەشتی هەولێر٥٣

هەمووجارێ لەمەجلیسی خۆش مەشرەفتا
کە ڕاپەڕینی پەنجا و سێ باسی دەکرا

---

(٢) ئیسماعیلی برام لە تەمەنی چل و چوار ساڵیدا، بە فشاری خوێن جوانەمەرگ بوو.

دەتفەرموو کە سویندت نەخوارد، لەگەڵ عەوام

بەڵام گفت و بەڵێنی مەردانەت تەمام

بردە سەرو گۆتت من بێ سوێند و تەڵاق

سوغرە ناکەم بۆ دەرەبەگ، گەر شەقبا شەق!

ئەفسووس ڕابوونی فەلاحی شکستی هێنا

زۆربەی جوتیاران چوونەوە بۆ سوغرەو تۆش هەر گوتت نا

ڕاست دەرچوو فەرمایشەکەت، دەتگوت دەچنەوە لای ئاغا!

بیرمە گوتت: من هەرگیز نەچەمامەوە، هەر دەمگوت نا

سوێندی زۆربەی وەرزێرەکان، کەوت وشکا!

تۆش بە یەکجاری یاخی بووی چەشنی قەلا

بێگاری و سوغرەت نەکرد و ئەوانیش با!

بۆیە سەربەرزانە ڕۆشتی و بارگەت بۆ هەولێرێ تێکنا!

بە ناچاری هاتیە شاری لە هاوینی پەنجا و حەفتا

هەرگیز نەچوویتە ژێر باری سوغرە و زوڵمی ئاغاو چەتە!

٢٠١٧/٥/١٦

حاجی (ساڵح گۆران)ی باوکم لە ١٩٩٠/٥/١٦ کۆچی دواییکرد.

## گفتوگۆی نەسازاوەکان

"دوو مانگ پێش ڕیفڕاندۆمەکە واقعێکی تاڵ دەخاتەڕوو"

**هاولاتی:**

ئەوریفڕانـــدۆمە و بـــۆ پـــێچکەی کورســـییەکی شـــڕ و لەقە
نەک بۆسەربەخـــۆیی و ڕێچکـەی کـەڕامەتی کـوردو هـەقـە

**کۆیلەی حیزبی:**

نـــا ئـــێمە ڕیفڕانـــدۆم خـــوازین !خـــۆش ئـــاوازین
بەســـەر گشـــت گـــۆی ئەم ســـەرزەمینەش دەنـــازین!
هەرچـــی شـــێخمان فەرمانـــدا بـــۆی بەردەبـــازین!
ئـــێمە لە جـــۆری مـــام ڕێـــوی و شـــێر و بـــازین!
شاهەنشـــایی هەر لە ســـــەرکردەی خۆمانـــــدێ؟
تـــاج وئاڵاشـــمان بەڕادانـــداوە وا بەرەو پیرمـــان دێ!
هەردێ هەردێ، دەســـــتووریش لە بـــۆ میرمـــان دێ!

**هاولاتی:**

ئەی دیموکراسیەکەو کـوانێ؟ ئـازادی ڕا، حـوکمەت کـوانێ؟
هەڵبژاردنـی سـەرۆک کـوانێ؟ پەرلەمـانی لەت لەت کـوانێ؟
لێتـان ڕوونـە دەیدۆڕێنـن بۆیـە خۆتـان دەسەپێنـن!
هەرگیـــز بۆتـان ناچتەسەرێ فیتنـە سازی و دانـە بەرێ!

**دەسەڵاتدار**

ئـێمە تـازە مەزنـێ ئێـوەین بە فیشـەک دەمتـان دادەخەیـن!

گەردەوڵەتمان پێ چێ نەبوو دەڵێین خەتای موعـارەزە بـوو!

گرنگە سەری ئێمە ساغ بێ! خەڵکـی تـر گشـتی یاسـاغ بـێ!

چەکـی نوێشـمان بـۆ هـاتووە ناحەزمـان دەمکـوت کـردووە!

کێ بڵێ نەخێر پێمان جاشە! پێشمەرگەش بێ هەر لەپاشـە!

بژی کورسی و سەرۆکی گشت دیکتاتۆرییەتی پشتاوپشـت!

**ئۆپۆزیسیۆن:**

بەپشـــــتیوانی هێـــــزی گەل دەو ڕووخێنـــــین!

ملیارەهـــــای تاڵانیتـــــان لـــــێ دەســـــتێنین!

ســـــەربەخۆیی ڕاســـــتەقینە بەدەســـــت دێنـــــین!

ئێمەبەرگریکـــــاری ڕاســـــتین! لێـــــو ناترســـــین!

بە هەڕەشـــەی خـــائین وجـــاش نـــاگەڕێینەوە پاشـــەوپاش!

بە فیشـــاڵێ ڕیفڕانـــدۆمتان، مـــافی خۆمـــان لە بیرنـــاچێ!

وادەزانـن ئەم مـیللەتە دەگەوجێـنرێ و سـەرچیغ دەچـێ؟

**دەسەڵاتدار:**

سـیری بخـۆن زۆرنـای لیـدەن هەڵـپەڕن و نزایـان بـکەن!

هانا بۆ کـوێ دەبەن بـبەن برسـی بـن سـەرتان لەبەرد دەن!

تـازە ئـێمە دەسـەڵاتدارین گـوێ نـاگرین، زاڵـم و غەداریـن!

خۆمان پۆشتە و تێر و پڕین قسەی کەس بە فلسـێ نـاکڕین

هاولاتی:

بەزمی قۆڵ فشکردنەوەیە بەردەوامی پیسخۆرییە!

پینەی شکست وخوارییە ! کوانێ بۆ دەوڵەت دارییە؟

خەڵکی خەریکە دادەڕزێ زستان لەسەرمان دەلەرزێ!

کە هیچتان لە باردا نییە! تا کەی ئەو قەیراندارییە؟

مووچەتان پێ دابین ناکرێ داهاتی نەفتیش قووت دەدرێ!

ئاو و کارەباش لەترازە مامۆستا و دکتۆر بێ نازە

کەمئەندام و خانەنشینیش دەژین بە تەمای خزم وخویش!

نان و ئازادی و کەڕامەت پیرۆز ترە لە ئاڵاو دەوڵەت

٢٠١٧/٧/٢٦

## نەخێرم پێ هەزم ناکرێ

"دووحەفتە پێش ڕیفڕاندۆم"

بـــۆ دەوڵەتێکــــی بنــــاغە بەهێــــز
دەنگـــم بەڵێـــیە لە گەل بگـــرێ ڕێـــز
نەک ترەکەڵەکـــی هەوای ســـەری گێـــژ
بە سـووکە پـاڵێ ڕێــی پــێ بکـرێ لێـژ
بـــۆ کۆمـــارێکی کوردســـــتانی بـــێ!
نەک هــی فـلان حیـزب و فیسـارانی بـێ!
مــــــیللەت یەکبخــــــا بە دادپەوەری
نەک شـــەڕداهێنێ بـــۆ ســـەوداگەری !

بەســیە پەرتکــردن بــۆ کورســـی و دۆلار
شــەهیدی کــوردان کــوا دێــتن لەژمــار؟
گەر بەراســتتانە دەوڵەت دروسـت دەکەن؟
بـــــۆچی هاوڵاتیــــان جەزرەبە دەدەن؟

پێشـــمەرگە یەکــخەن گشـــت کــۆببنەوە
بـــۆ قـــازانجی خەڵـــک بگەڕێــــنەوە
کـــوردێ دڵســـۆزبێ بـــۆ کوردســـتانی
خـــاک هەراج ناکـــا بـــۆ بازرگـــانی

هەرچەنــــدە کەمـــن  یەکجـــار نـــاڕازیم
لە حـــوکمی ئێـــوە و  دژ گەنـــدەڵبازیم
کەچـــی نەخێـــرم  پـــێ هەزم نـــاکرێ
بەڵێـــی زۆرەملـــێش هـــیچ بەرهەم نـــاگرێ!

گەردەنگـــش بـــدەم، بەڵـــێم بـــۆ کـــوردە
نەک بـــۆ دەوڵەتێـــک  بـــۆ دز و جەردە
گەر جاڕیش نـــەدرا  وەرنـــــە مەیـــدانێ
بڵـــێن بەرنـــامە و پلانتـــان کـــوانێ ؟

بـــا بەرەی بەڵـــێ و نەخێـــر یەک بخەیـــن
تـــا بە هەق بە ســـەربەخۆیی بگەیـــن
بـــۆکەس نیـــیە تاسەردەســـەڵات وکورســـی
ناپـــاکە  هەرکێـــی  گەل بکـــات برســـی

مـــن ترســـم هەیە ڕیفراندۆم درۆ بـــێ!
بـــۆ بە کـــاربردن چەواشـــەی نـــاوخۆبێ!
بـــۆ سازشـــکردن، بچـــنەوە بەغـــدا
دەوڵەتی کوردیش  بدەنەوە دەست  خـوا !

٢٠١٧/٩/١١

## مەهێڵن دەربازبی

هۆیهـا دزە! بیگـرن مەهـێڵن دەربـازبی بەسـیە حیـزی
پاشەڵپیسە! پاشەکەوت و مـووچەی ئێـوەی خـڕی دزی!
سەرکۆنەیکەن، لە ناو حاویەی زبڵێی بـاوێن، جـاترۆیکەن
سەد شەقی مزری تێهەڵدەن وەک کۆنـە پـێڵاو فڕێیـدەن!

٢٠١٧/١٢/٣٠

## ڕاپـەڕیـن

ئەوسـتەمەی چـاوچنۆکی
خـۆیی دوای ڕاپەڕیـن کـردی
نـابووتترین بێهـوودەیی
چەسپاند کەر کردی و گـا خـواردی

٢٠١٥

## بەرشەقدانی مامۆستا خانەنشینەکە

کە مامۆستا بەر شەقدرا بێ ئومیدیم گەیە لوتکە

وا دەزانم کەرامەتی گشتمان بەرشەق دراوە و ئەتکە

نەفرەت لەو زڕتە بۆزەی کە تۆی ئەوها ڕاسپاردووە

بێشک شایەنی زیندان و تێهەڵدان و قامچی و پەتکە!

ئەوەشی پێی خۆشحاڵبووە ئەرکی دەماخ بەتاڵبووە!

بۆ ڕەزامەندی سەرچەتان وەک دەروێش تووشی حاڵبووە!

تۆ کێی گەمژە، تا مامۆستای خانەنشینمان بەرشەق بدەی؟

کێ پێی گوتی چاوترسێنی بەسالاچووی میللەت بکەی؟

چەقۆ وەشێن و بەرەڵلاکان سندم کەن ! هەتا زووە!

خەڵکە ئەو بێرێزییە تاکەی؟ دارو بەرد بێتاقەت بووە!

کۆت و بەند تووڕ هەڵدەن دەنا درەنگە وا کات بەسەرچووە!

هەولێر "ساڵی بەرشەقدانی مامۆستاکە"

# تەکنۆلۆژیای بورجوازی مافیای گزی

گاڵتەوگەپ :"دوای تەزویرەکەی هەڵبژاردنی ٢٠١٨"

بە بـەرنامـەو بەهـاکــەوە بــەسرکردنی تاکــەوە!

بە مۆرفیــن و سیکۆتیــن و تریــاکەوە

بە هەڵلووشـــینی گـــازەوەو بەنەوتەوە

بە فـرۆشتنی خاکـەوە

بـــە کەوگیـــر و بـــە سیـــکاردو بەمەنجـــەرو بـەمـــراکەوە!

هەر لـــە بــێ هیـــوا کـــردنی دەنگـدەر بە خـراپ وچـاکەوە!

بە قوتـــدانی دەنــگ و ڕەنـــگی تــاک تــاکی خانـــەوادەوە!

بـــە داپیـــرە و بـــە دایکـــەوە ! بــە باپیـــرەو بــە باوکـــەوە!

بە زاک و مـــاکی ڕانەوە ! بە داڵ و نەجـــــمەی شانـــــەوە!

بە ســەر پشــتی خەفــیەی کــۆڵان! پیــر و کەنەفــت ولاکەوە!

بەرۆژی ڕووناک شەوتان باش! برای دوژمن بۆ یەک سەرتاش!

بە سواری هێستر ســواری جــاش ملیۆنــان بدەنــە شــاباش

بەلاگز سیش لێدەن تەناش!

خێـرا خێـرا، هێـواش هێـواش بــەرەو خــەرەند بــڕۆن بەلاش

بە بەگ بێــنەوە پاشــەوپاش بــۆ ســەری بەتــاڵ و پــڕ غەش

چەشنی بـزن و کاریلەی جوانکیلە و گای قەش

بچنە لای خمچی و پاشان سەر بگرن لە هەش!



تلی لیلی و قلی ویلی!

دیسان دز سەرچۆپی کێشە و لێرە قەت پێی هەرنازەلی!

هەش بە سەری خدر و عەلی! بژین بەحیزی و زەلیلی!

لە کەسنەزان و هەرتەلی!

تا ئەوهابی ئۆباری خەڵکی و لە ملی!

تەکنۆلۆژیای بورجوازی مافیای گزی !

کلی لە چاوی مامزی خارە کاکلی دەدزی!

هەولێر ٢٠١٨/٥/١٤

گزی ؛ تەزویر

## سێلفی

کورە! گەلحۆ !مەسئول تەنیابۆ دەنگەکەت دەتگەمژێنێ

سێلفییەکت لەگەڵ دەگرێ تا دەنگەکەت لێ بستێنێ

دوای هەڵبژاردن نایبینییەوە هیچ منەتی پێت نامینێ!

خۆڕا ناڵێن تاسەر بمینێ هین! هەرعاجباتییان دەبینێ!

٢٠١٨/٥/٤

## شۆك!

"وەڵامی ئەپڵیکەیشنێکی فەیسبوک"

گەر بـــێ وجارێـــک لەخەونـــێش دانـــدرێم بەســـەرۆک!

ســـــوپای داگیـــــرکەر لە کوردســـــتان قـــاو* دەدەم!

هەر قەزەمـــێ بـــۆ دوژمنـــان بێـــتە ســـەر چـــۆک!

بـــێ دوو دڵـــی، حەشرێکـــی ئەوهـــای پێـــدەکەم

ببـــڕای ببـــڕای، ســـەرنەویبێ و تووشـــبێ بەشـــۆک!

٢٠١٨

*قاو دەدەم : دەردەکەم

## تامپۆن لە فەنتەلۆس

گەر دەســـت و پێوەنـــدەکانتان، ئەوهـــا بـــکەن بـــۆ تـــامپۆنێ

کـــوڕ لە بـــاوەش، دایکـــی بەر گـــولله بـــدات و تێـــی تەقێنـــێ

قـانون چـیـیە؟ مـیللەت کێـیە؟ چەکـی کـاک فلانـم لە مشـتە

دەکوژم، جەرگی خەڵکی دەبڕم !حیـزب و عەشرەتـم لەپشـتە!

گەرکەپووی بێچووی سەر زلێ! خوێنێ لێبێ، چی دەقەومـێ؟

ڕەنگبـێ وڵات ژێـراو ژوورکـات هێـرش بکـاتە سـەر قەومـێ!

ئەو توندڕەوویەی ئێرە ڕاگرن چەکداری کوردی بەرەڵا
بۆگەنی ئێرانەی تەنی چەکبازیش لێی بۆتە بەڵا!

کوردێنیتان زیفی دەرچوو وەک دروشمی سەربەخۆیی
دەوڵەتیشتان هەر بێبن بوو دڵ و قودسەکەشتان ڕۆیی!

دەسەڵاتێکی سەقەتی بێباک لە گەل و خاک، قەپات!
تەنها چینی چەوساوەی دادۆشی وڵاتی، کردە نەهات

ئەم پەروەردە چەتەگەرییە هی حیزبی بیرۆکراسییە!
عەقڵییەتێکی خێڵبازی : نا ڕێک تر لە هی بەعسییە

لەسایەی حوکمی فەنتەلۆس کوشتن و دزین ئاسانە
مرۆڤکوژ تیایا وەک پاشایە! بۆخەڵکی بێ چەک زیندانە!

هەولێر ٢٠١٨/٦/٢٣

## هەستی گیرۆدە

ئەریٚ کیـژیٚ ڕووی ڕازاوەت کـوانیٚ بە مـن وەسـف دەکـریٚ؟
هەنـدە شـیرین و قەشـەنگی هەنگـوین لە زارت دەبـاریٚ

بێدەسـتی خـۆمە دڵ تەڕم هەر چەنـدە بـیٚ هێـز و پیـرم
حەز دەکەم بـۆنکەم گەردنـی جـوانیٚ خـۆی بـوو بە هـۆگرم

بـۆیە لێـرە نـاوت نـابەم تـا کەس لە نێوانمـان نەگـات
چون ئەو ئەشقەت درەنگ وەختە، بازیان لە نەونەمـام نەدات!

داواتکرد شیعریٚ دانـێم بـۆت بشـێت بـۆ بـاڵاو ڕووی گەشـت
هەسـتی گیـرۆدەم بکێشـێت نەخشـی بـرۆ و چـاوی ڕەشـت

ئەوچەنـد وشـە کـرچ و کـاڵەم پێشکەشـە بەو گـوڵ هەنـارە
بەختـت لە بەرزی دەبیـنم وەک مانـگ لە ئاسـمانیٚ دیـارە

هەند بە تەماشات سەرسام بووم خوایە هەروا پڕشنگدار بێت
جوانیت کێشـم دەکـا و ئەقڵـم دەخوازێـت دوور لە ئازاربێـت!

٢٠١٨/٨/٢٥

## مامۆستایەکی پاڵەوان

مامۆستایەکی پاڵەوان

ویستی ڕووداوەکان بکا

بەشیعروکورتیلە چیرۆک

بەڵتەجیـەکی چەقو وەشێن زراوی چـوو

قەڵەمەکەی لێ شکاندو

گرتی و ئەوهەر نەچووە سەرچۆک

گوتی نەفرەت لەو حیزبەش بێ

کادیـری وەکو تۆی هەبـوو

وەک گای قەشبێ!

ئەو قوتابخانەش تۆی لێدەرچوو

تفوو تفوو لـەوحوکمەتـەش

خـۆپیشانـدەر بداتەبـەر شەق و چـەقوو

تفوو تفوو

٢٠١٨/٣/٢٩

# ئەشقت کۆن نەبووە هەرنووە

گەر دەپرسـی دوای دابڕانمـان ئـاخۆ منـت لەبیـر چـووە؟
لەمێـژە، جێـت هێشـتووم هێشـتاش ئەو ئەشـقەت لە دڵ زینـدووە
تینـی ئەو ئەڤیـنەت گـوڵێ ڕۆژ بە ڕۆژ گڵـپەی سـەندووە
هەتـا دەمـرم دەنـاڵێنم عەشـقت کـۆن نەبـووە، هەرنـووە
هەمـوو جـارێ کە بە لای کـۆنە هەوارتـان ڕادەبـوورم
کـزە لە جەرگـم هەڵدەسـتێ ! دەڵێـی تـازە دڵ پێکـراوە
گریـانم بـۆ حـاڵی خـۆم دێ هەزاران میـل لە تـۆ دوورم
دڵ وا شـێواوە لای وایـە دوێنـێکە تـۆی لـێ ڕەنجـاوە!
داخـوا لەو مـاوە حاڵـت چـۆن بـووە و چـۆن بـۆت گـوزەراوە؟
وا هەسـت دەکەم نەتوانیـوە منـت هێشـتان لە دڵ مـاوە
گەر وا نەبیـت کەواتە تـۆ درۆت لە گەڵ مـن کـردووە
عاشـقێکی سـاوێلکە بـووم، دیـارە پێمـت ڕابـواردووە
گەرئەوعیشـقەت بە ڕاسـت نەبـوو بـۆ ڕێـت دام دەسـخەڕۆت کـردم
ئەو نـامە گـڕدارانەی ئە وینـت بـۆچی بـۆ دەنـاردم ؟
ڕەنگبـێ بڵێـی جـا کـوا کچـی ئەم وڵاتە ڕێـی پـێ دەدرێ؟
بگـات بەوەی خۆشـی دەوێ! یـان هەر دەم ڕێـی لـێ دەگیـرێ؟
هەر چـی بڵێـی دادت نـادات دەردێکـی وات پـێم کـردووە
تـاخوێن لە جەسـتەم سـوورِ دەخـوات ئەو دڵەم هەر ئەشـقی تـووە

هەولێر ٢٠١٨/٧/٢

## وەختە ئەم ژینە جێ بێڵم

"کاتێ زوڵم دەگاتە لوتکە ژیان تامی نامینێ"

**بەشی یەکەم**

ئێستا کە زۆر دڵم تەنگە ڕاستی وەک پووشە بێ سەنگە
هەندە توورە و سەرگەردانم خەفەت لەم میللەتە دەخۆم
خەفەت لە حوکمی سەقەت و عەقڵی سەقەتی خۆم دەخۆم
لێرە هەرچی ڕاست بێ نەنگە!ئەوەی ڕێزداربی هەرچەنگە
کێ هەق بێژ و گەل پەروەربێ بەردەوام هەر باری لەنگە!
ئەوا خەریکە شێت دەبم سەری خۆم هەڵگرم و بڕۆم
دنگ! دنگ !دەمی کوڵنگ بدەم لە کەلەشی دزێوی ستەم!
خەریکە ونکەم ڕێگاکەم ڕوو لە چۆڵ و سەحرا دەکەم

★ ★ ★

هۆشمەندی دەردێکی قورسە! پڕ لە دێو و درنج و هرسە!
کەرێتی خۆشە بێ پرسە ؟ مێرگوزارێکی بێ ترسە
سواری کەرێ خۆشترە لام بێ سین و جیم و بێ وەلام
لە وەنەوشە و لە لاگزی حیز و دزی گەوج و نەفام
جزدانی بە تاڵی خۆمم پێ باشترە، لە پووڵی مۆڵ
لە بانقی پڕ لە دۆلاری مەسئولی بێ ویژدان و زۆڵ
بێ دەستی خۆم دڵم تەنگە پڕ ئاشووب و درۆی جەنگە
ڕۆژی ڕوونم شەوەزەنگە ڕاستی وەک پووشە بێ سەنگە
خەریکە هەولێر جێ بێڵم بەرەو چۆڵ و بەڕیا بڕۆم
وەختە ئەم ژینە جێ بێڵم دەست لە دونیای درۆ بشۆم!
نەک هەناسە سارد بناڵم، بمێنم هەر خەمان بخۆم!

هەولێر ٢٠١٧/٤/٦

**دڵم زۆر عادزو تەنگە**

**هەندێ تاقمی چرووکی کوردی وا دژی خەڵکی لەجەنگە!**

**ئەوەی لێرە ئەڵقە لەگوێ و نۆکەر نەبێ، پێیان نەنگە!**

**ڕاستی لێرە بەڵمە برنجی شارەزوورە، هەند بێ سەنگە**

**عەشرەتباز و مرۆڤ کوژ نەبی بەردەوام هەر بارت لەنگە!**

**خائین سینگ دەردەپەڕێنێ! وەک پێڵاو بە پێی من تەنگە**

**زوڕنا ژەن سەرم دێشێنێ ! خۆرەتاوم شەوەزەنگە!**

**چەند ین ساڵە حیزبی زریان و ڕەشەبا!**

**حیزبی کەڵەگا و کونە با ! خەڵکی خۆی لە خشتە دەبا!**

**ئەوەی عەقڵی بە کار بێنێ وەک دوژمن لێی ڕادەمێنێ**

**بیرمەندی کارێکی قورسە ! کەرێتی خۆشە بێ پرسە؟**

**پیادە ڕۆیینی ناو جادەم سواری کەرێ و کەچە لادەم**

**هەزاران جار پێ چاکترە شەریفانە ترە هەر دەم**

**لە مۆنیکا و لە وەنەوشەی دوا مۆدێلی، بە خوێن کڕای**

**بندیوارو ڕاوەڕووتچی چەکداری خێڵی ناو زڕای**

**ئەڵقە لە گوێی دۆلار، درهەم سەرکردەی بێ ویژدان و خەم!**

له کەرستەی مارکە وسعاتی بەچکەی بنەماڵەی بێ بەرهەم
جلکی شڕی لەنگە و کۆنەم پێڵاوی کون، پینە پینەم
هەزاران جار پێ باشترە لە ڕانکو چۆغەڵی گرانی
خۆماڵی مەرەز یان کری؟ بێچووی چەمووش و کەمزانی

لە قات و ڕیباتی مۆڵی پارەی دزراوی وەک خۆڵی
نەهەنگی چاوبرسی و زۆڵی هی نەوتی خەڵکی کلۆڵی
برسیکراو و ڕەتێنراوی ! خەوێنراو و تۆقێنراوی
بە نۆ قەدان ئەنگاوتراوی ! چی وچیتری ! لێکراوی

گیرفانی شڕ و بڕاوی! خۆمم بێشک پێ چاکترە
لە ملیاران دۆلاری کێی لە کۆنە جاش ناپاکترە!
بەئاشکرا لرفکراوی کۆنە دزی نوێ و پەنماوی!
مەسئولی لامل و غەدار! خۆ لێ گۆڕاوی جەردەی هار!

بۆیە ئاوا پشووم سوارە لەم بەناو شارە پایتەختە
ژیان بۆ من، هی وەک من چەند بڵێی سەختە

وەخـــــتە لەم هەولێـــــرە بـــــار کەم

سەری خۆم هەڵگرم یەکجاری  لەم کوڵەمەرگیـە خۆم ڕزگـارکەم

تەنیــام لێــرە، لەم هەوارەم  دەســـت لە ملانـــی پەژارە و خەم

یان دەبی کۆیلەی حیزبان بی  یان ژیانت چەشنی زیندان بی

هەنــد خــراومەتە ژێــر فشــاری  حیزبــی نالەبــاری کــوردی

کەرســـتەی دەســـت نادروســـتی! پیلانگێــڕی دۆڕاو بـــێخەم!

پیشـــە کەڵەگـــایی و دزی و زۆر شـــتی دی و جەورو ســـتەم

شوێنێک شک نابەم بۆی بڕۆم

دەنا هەقـە هـەتـا زووە دەسـت لەم حیزبچیانە بشـۆم

دەشت و دەریش یاساغە بۆم!

گەر بەردەوام بێ ئـەم دۆخـە  مەرگم تەنکبووە لە ڕۆخـە

دەشزانم گەر

بشمرم جێگەیەک نییە  تیای بمنێژن !

نە لێرە نە لە دەشت ودەر

دەشترسم هـەر

تـاڵاوی دوای گیان دەرچـوونـم،  بـە کـەس و کـارم بچێـژن

سکاڵای خـۆم لە لای کێ بکەم ؟ عـەرزی حـاڵم بە کێ بـدەم؟

دادگاش دەستەمۆکرای حیزبە  ئاسایشیش هەردەڵێ حیزبە!

منی تـاکی پـاکی بێ فـێـڵ  بـۆم ناکرێ ببمە حـیـزبی خێـڵ!

هەڵاتووی دەست چەکداری ملهوڕ، گوێمەدێی، کەس و هـۆزم!

کـزبـووە دەنـگی زوڵاڵـی جـارانی پـڕ جـۆش و ســـۆزم

کاس و ســەرگەردان و وێـڵم وەختە ئەم شوێنـە جێ بێـڵم

دەست لەدونیای سەڕاب بەردەم

لە داخی بێ ئەقڵی خـۆم و بێتـام لـەرزۆکی ئەم خەڵکـەم

دەست لە ژینی بێ سەمـەری وەک دۆزەخی ئێـرە بـشۆم

هەزاران جار باشترە بـۆم

نەک هەناسە سـارد تـادەمـرم بنـاڵێنـم زووخـاو بـخۆم!

هەولێر ٢٠١٧/٤/٩

## هەنجەت

(خۆیان دەفرۆشن)ێکی هەڵەی پەرلەمانتارێ چی قەوماند؟
نەوت دزیـــن و برســـیکردنێ مێروولەیەکـــی نەجوولانـــد!

دەڵـــێن هەنجەتـــی تـــڕ نـــانی هەرزنە خـــواردنی جـــۆیە!
دەنـــا ئەو بێڕێـــزیەی ئەوان بە شـــەهید دەیـــکەن وەتـــۆیە!

٢٠١٦/١٢/١١

## بەرپێنە

هەر کاتێـــک مـــن شـــیعر دەچـــڕم
خەڵکێـــک بـــەرپێنـــــەم دەداتـــــێ
خـــــەم دەخـــــۆم لە زاڵـــم پـــڕم
کۆیـــــــلەش تەنـــــگاوە بیـــــگاتێ!

٢٠١٦/١١/١٠

## وشەی من

تکـــا دەکەم کـــێ میزاجـــی بە وشـــەکانم تێـــک دەچـــێ
هەرچـــی زووە بـــا لەفەیـــس بەرێـــزەوە بـــۆ خـــۆی لاچـــێ

وشـــەی مـــن بـــۆ هـــیچ لایەن و کەســـی حیزبـــێ نەدرکـــاوە
هەر بە قوربـــان میللەتـــێکە خـــوێنی وەک ڕووبـــار ڕژاوە!

هەولێر کانوونی یەکەم ٢٠١٦

## شەوێکی شووم لە تاران

ئەمشەوشەوێکی زۆرشوومی عەجەمییە، گەل خەمناکە
شەوی هەینی خنکاندن، شەممەی تیرۆری ڕۆڵەی خاکە
لەکوێ ئاخوندوعەقڵی چەقبەستوو هەبێ، ژین دەردناکە*
پێشکەوتن و ئازادی مرۆڤ قەدەغەن، چەشنی تریاکە
ئەمشەو پرسەبارم لێرە چاوەکانم بووینە پشکۆ
چون دوژمنی کەڵبەبەخوێن میللەتی خستیتە ڕۆڕۆ
سەیرە کێ تێتان هەڵدەدات؟
ئابووریتان وێران دەکات؟
ئێوە کێ دەگرن بەئامانج ؟ کوردی بێ پەنا ودەسەڵات؟
ڕۆژئاواو باکورو باشوور وا لە پرسەن بۆ ڕۆژهەڵات
ئەمشەو تاران بە مەرگی پۆلێ ئازیزان منی گریان
بەمووشەکی ڕق و کینەی تیرێکی لەجەرگم چەقان
بۆیێ ئەوها قوڕ دەپێوم لە داخی بێکەسی کوردان
وڵات ڕەشپۆشە بەدەستی ئاخوندی مەزهەبچی، نادان!

تاران ١٠/٩/٢٠١٨

*دەردناک : بەژان، فارسییە

## چیبکەم لەداخی ئەم گەلە

گەربمێـــــــنم بەم حـــــاڵەوە لە گەندەڵســـــــتانێ
دە ســـــاڵی تـــر ســـوتاوترم لە تەنـــوور و نـــانێ

چـــی بـــکەم لە داخـــی ئەوگەلە جـــێماوەم چانـــابێ
وارێـــک ژیـــانی تیـــا نەمـــا بچـــۆرە گۆڕســـــتانێ!

٢٠١٦/٦/٨

مـن تەنهـا بـۆ گەل دەسـووتێم
هەن هێشتاش نازانن من کێم؟
٢٠١٨

# پەری خەیاڵ

پەری خەیاڵم داگیری کردووم
ڕێ نادات بێمە زیارەتی باڵای
تێکڕای ژیانی بەتاڵان بردووم
هەر دانابەزێ لەبورجی باڵای

پەپوولەی هەستم بوویتە پەروانە
دەسووتێ وەک مەم لە شەوقی چرای
شێت وشەیدایە و ئۆقرەی نەماوە
لەدووری نیگای دەناڵێ وەک نای!

دەڵێن ژین خۆشە بێ تامە بێ ئەو
لە گەڵما نەبێت بە درێژایی شەو
خوڵیای ئەو دەمەم ماچ کەم ئەو دەمەی
گوێ بگرێ لە دڵ بۆنکەم شەمامەی

ئەوا بەسەرچوو زەمەن جێی هێشتم
لەجیاتی ئەسرین خوێنی پێ ڕێشتم
وەرە ئەمجارەش بێرە باوەشم
تەنیاو بەد مەستم بێ مەی سەرخۆشم

گیانە تەنیایی هەر بۆ خوا باشە
نۆرەی تەبایی و ماچ و باوەشە
ڕەحمێکم پێکە و زوو بگەڕێوە
نەخۆ دەردەچێ ڕۆحم لە جێوە!

٢٠١٨/٨/٥

## بۆ ٣٨ ساڵیادی ڕەنجبەر

لەســاڵیادی شــەهید بوونــت حەسرەت دەبــارێ لە چاومــا
گــڕ هەڵدەســتێ لە دەروونمــا، زووخــاو کــراوە بە هەناومــا

منــی هــاوڕێ و خوێنــدکارت نــازانم باســی چیــت بــۆ بــکەم!
ئەی شــاعیری یــاخی کەوتیــنە بندەســتی تــاقمێکی کەم

دوای تــۆ هــاتن جەردەی سیاســی بازرگــانی کــورد فرۆشــتن
چیت چاندبوو !هەڵیان کێشــا دەســتیانکرد بە ئومێــد کوشــتن!

تــاکی کوردیــان تێــک شــکاند و میللەتیــان لە قــوڕێ چەقانــد
چی دوژمن پێی خۆشبوو کردیان سەریان بۆ دانەواند لەقانــد!

تەنیــاو بــێ تــۆم تێــدا مــاوم کەوتــوومە بــن بەحــری خەمــان
پیــــریش بەرۆکــــی گرتــــوومە وام لە چنگــــی غەدری زەمــــان!

هەولێر ٢٠١٨/١١/١٧

## گلکۆی سەگێکی پیرۆز کراو

"چیرۆکە شیعرێکی ئەفسانەیی و پەروەردەییە"

پاشـــایەک هەبـــوو لە مێـــژوو چـــاوچنۆک، دژی گەل، بەدخـــوو
زێـڕو پـارەی زۆر خۆشدەویسـت ڕۆژێ سـەربردەیەکی بیسـت
تاوانبـــــارێکیان هێنـــا لای وتیـــان: گـــەورەم بیـــدە ســـزای
*(دە پێم بڵێن چی کردووە؟)
+کافربووەو سەگی ناشتووە!

کفـــن و تـــــەڵقینیشی داوە! ئــــەوەش بوەســـتێ لـــــەو لاوە
لای مەزاری"شـێخ مەمونـد"ی لە گۆڕسـتانی خـوار گونـدی
ناشتوویە چەنـدی بەچەنـدی؟ نـاوی نـاوە: شـێخ ئەفەنـدی!)
عەوام کە دەچـنە سـەر گـۆڕی بـۆ مـرازی دڵ، نیـازی کـوڕی!
هەندێ پووڵیـان لـێ وەردەگـرێ بە پیـاو چـاکیش دەژمێـردرێ
ســـەگ و تـــوولەی زۆری هەیـــە دەوڵەمەندێـــکی قـەبـەیــە
لە پـرێـــکا زەنگیـــن بــــووە پـرۆپاگـەنــدەی بـــۆ کـــــردووە
ناوبـانگی لەدەسـت دەرچـووە! سـەی بە پیـرۆز ناسـاندووە )

(پاشا توورە بوو نەڕانـدی چـۆن سـەگ دەنێـژرێ لە شـەرعی؟
دەزانـی حـوکمی تـۆ چییـە ؟ کوشـتنیش بـۆ تـۆ بـەس نییە!

دەبێــت پــارچە پــارچەبکرێی! جــا لەکــووره بســووتێندرێی!)
سەگـــــەوان هەڵ لــــــەرزی زانـــــی  پێـــــوە بـــــووە!
ڕێـــی دەرچـــوونی ئەســـتەمەو لەدەســـت دەرچـــووە
کەمــێ سەنــگراوە و بیرێــکی  لەڕێــی دەربازبــوون کــردەوە
گوتی :+ (قوربان با بۆت باسکەم
مۆژدەیـەکی خۆشــت پێ دەم
بەڵام نابێ کەس گوێی لێ بێ
تەنیا پاشای گەورەم دەبێ  بەتەنێ بێ!)
بەچپەچپ : چووە بنگوێی  پاشا و گوتی:
(خاوەنەکەی ئەو سەگە بەر لە مردنی
فریشتەیەک لەخـەویا هاتبووە کنی
لەو خەونە پێــی ڕادەگەینـــێ ؛ ئەو ســـەگە گەلێــک پیـــرۆزە
نـــاوی هەرمـــاوە و دەمیـــنێ  لەعێـــلی فـــڵان تیـــرە و هـــۆزە
ســـەرجەلەی ســـەیدی ســـەروەرە  لە ئەولیـــاش ســـەروو تـــرە
دەبـــێ لای فـــڵان شـــێخ بینێـــژن  وەســـیەتەکەی بـــۆ تـــۆ بێـــژن!

لــەو وەسیەتــەی، منی ڕاسپــاردووە کـــەوا
نهێنی ئەو سەگ، مەرقەدەی بگەینمە پاشا
ئەو سەروەت و پــارە زۆرەی
خێر و بێری ئەم سنوورەی
گشت بدرێ بە پاشای گەورەی!

**من لـه ڕێگابـووم بێمـه لات**

پیاوانت منیان گرت، بێ هۆش نەیانهێشـت بەنـدە قسـە بکـات
بۆت بێژم خەبەرێکی خـۆش زێـڕ و زیـوی لە ژمـار نـەهات
زۆر لە نەوت و غـاز چـاکترە دەیـان "کـوپە زێـڕ"ی هـەیـە
هەمـووی لە بـۆ تـۆ دانـایە! نهێنـیش لای تـوولە سەیـە!
ئەم تـوولە سـەگە گوجیـلەی هەمـان گـۆر و دێـڵە سەیـە!
مەپرسـە چەنـد ئێسـک سـووک و نـورانی و ئەسـڵزادەیە !
کلیلـی چەنـدین قاسەیـە! خـەزنـەکی یەکجـار گەورەیـە)
پاشـــا کە زانـی وا چەورە گـوتی:( تـۆ توانـای خـوای گەورە!)
کەیفسازبـــوو سـەری سـوورا ڕووگـرژی بە خۆشـی گـۆڕا!
بە هەشـتاوی بڕیـاری دا نـــاوی" سـە"ی پیـــرۆزی لێنـا
(ماشەڵڵا لـە کـــارت خـوایە سـەگی موعجیـزە ئـەوهـایـە !
چەند بەندەی خۆت خۆشویستووە چەند ڕێزت لە ئـاژەڵگرتووە
وەسیەتەکەی جـێ بەجـێکەن زووکەن کـابرای سـەگدار بەردەن

مەزارەکەی بە ناوی قوتبی سانی کەن!
با گشت ڕەعیەم خێر و خێراتی بۆ ببەن!
هەموو سەری مانگ و ساڵێ زیارەتی کەن

خێـرەکەی قەت تەواو نـابێ نـاوی شـێرە و زمانتـان ڕابـێ
بـڕۆن تـوولە و کلیـل بێنـن! نەوەی قوتبـە مەیـڕەنجێنن
بەڵکـو خـوا لێتـان ڕازی بـێ مـن ڕازیـم بـا ئەو قـازی بـێ )
کـــابراش گـــوتی :+دەبـــێ خەڵکـــی ورد و درشـــتی
بچنـــە ســـەری، لە بـــۆ مرازیـــان، بە پێـــی پەتـــی!
ئەو بـــاش ســـەگە مـــوعجیزەکی بـــێ وێـــنەیە

بــــۆ دەوڵەتـــــی شـــــای ئـــێمە پشــــت و پەنـــــایە!
ئەوپووڵەی بۆ ئێرەی دێنن لای خوا سەد هەنـدەی دەسـتێنن!
+سەگدار بوو بە"باش پاسەوان" سەدا دووی بـۆ دانـا سـوڵتان

ئەو تووتکە سەگەی لێـێ جێمـا لای کۆشـکی پـا شــا دانـدرا
فەرمــانی شاهانـە درا
زیـارەتی ئەو تـووتکە سـەگەش بــە ئــەرککــرا ! دۆڵ لێـــدرا
ســاڵ دوازدەی مانـگ ئەو مەرقەدە و تووتــکەکانی پیـــرۆز کـرا
+(قەت مەهێڵن دڵی بشـکێ قــەپ لە هەرکــێ بگـرێ هەرکـێ؟
نەکەن بە خراپ تەماشای کەن کێ فزەی کرد سـەری پەلـدەن!
بژی تووتکە سـەگی پاشــــا جـار جـارەش وەرنە تەماشــــــا!
هەرگیز نەکەن بێ دیاری بێن لەڕێی ئەو گشت هاوشاری بێن)
(مەزاری (شێخ سـە)ش پیـرۆزە! جێنـزارگەی ئەجـدادی هـۆزە!
ئەو ســـەگمەزنە میراتــدەرە! ڕزق و ڕۆزی وەدەسـتخـــــەرە !
بەلای کەمــی ســاڵی جـارێ یـان گشـت نــەورۆز و بــەهارێ
خــاو و خێـزان بــۆ زیــارەتی خۆتـان ڕسـتکەن بــۆ خزمــەتی
کێی نەچـتە سـەر مەرقەدی ئەو نەفرەتلێکـراوە و بـێ بەش لەو
ئــاو و هــەوای نیشـتمـانــە دەبێتــە سـۆدرەی زەمــــانـــە
گشت دەسکەوتی لەکیس دەچێ لە قیامەتێش هەر تێ دەچێ!
ئــاواتی قــەت نایێتـــە دی نــاوی دەنـرێ، نــدی و بـدی
کێیش بۆتووله سـەگم باشـبی کڕنـۆش، زیـارەت، بـۆی بەلاش بـی!

خەڵکی پۆل پۆل لەخزمەتبوون هەند کۆیلە و مەزارپەرستبوون
ڕۆژگارهات و ڕۆژگـار ڕۆیـی لــە گەڵ خــزم و کــەس وخــۆیی
بـــوو بــە دەمـەقــڕە و هــەرا بـــاج و خەراجیــان بـۆ نــەدرا

میللەت هاواریان لێ هەڵسا! وتیان بەسیە تا کەی پاشا؟
دەستیان کرد بە شۆڕشگێڕان سەی پاشایان هێنا قڕان
پاشا کە ئەو وەزعەی بینی ویستی دیسان بیان گەوجێنی
لە ترسانیش هەڵدەلەرزی دەیگوت من دەیکەم چاکسازی

خەڵکی باوەڕیان پێی نەکرد تەخت و تاراجیان لە ناو برد
بە سێدارەیان هەڵواسی گۆڕ بە گۆڕ بوو نەما باسی!
کێ دەرس لە مێژوو وەرنەگرێ ڕۆژێک هەر دێ سەرگوم بکرێ
خەڵکە مەبنە کۆیلەی بەشەر وەهمی درۆی بێ سەرو بەر
بۆ ئازادی و دادپەروەری بژین بە بوێری و جوامێری
تێچوون بۆ حوکمی زۆرداران ژینی شەرەفمەند بۆ هەژاران
گەلۆ لەمڕۆوە بڕیار دەن حوکمی زاڵمان بەسەر نەخەن
بکەونە ڕاوە گەندەڵان ! قڕکەن تازی و تووڵەی سوڵتان
گڵکۆی سەگەکان لە ناوبەن مێژووەکی نوێ دابهێنن
نەوە دوای نەوە بیخوێنن کۆنە قاڵتاغ بسووتێنن
تاڵانکەر و مشەخۆری دێوەزمەی شەڕباز تڕۆ کەن!
چەتەی سەرمایە دز بۆگەن ! ببڕای ببڕای دەستخەڕۆ کەن!

هەولێر ٢٠١٨/٣/٧

# سێ بروسکە شیعر بۆ ڕەنجبەر



ئاگات لێیە ڕەنجبەرەکەم

ئەی شابازی شەهیدانی نەتەوەکەم

شاعیرە پشتگوێ خراوەکەم

هەرگیز لە فیکرم دەرناچی

دەڵێی لە ناو دەمارەکانی خوێنمدا دێیت و دەچی!

لێم تێکچووە، وا دەزانم من جەمیلم! تۆ سابیری!

ئاگام لێتە، تێم دەڕوانی زۆربە عادزی وغەمباری

ئاگات لێمە، چەند بەدەست ئەم جامبازانە گرفتارم

لە بەربیری کۆنە و ڕزی خەریکە جێ بێلم وارم

ئاگات لێیە؟چەند درۆزنبوون لەگەڵ خاکی

لە گەڵ ڕۆحی هەڵپرووکاوی کوردەواری

ئاگام لێیە، ئاگات لێیە؟

تۆ بوویتە قوربانی ڕێی خاکی چەوساوان!

کەچی دوای تۆ سوپای تێکدەران هاتن خوێنی شەهیدانییان

هەراجکردو پووشیان لەپشت ئێمەبەست و گەلیان فەوتان

وشەو ڕستەی شیعرەکانییان شەهید کردی بێ تێرامان

**هاتن جەردەی سیاسی هاتن**

ئەوانەی کە پـێچەوانەی بەرژەوەنـدی خـەڵک و وڵاتـن

هـاتن خـاک و بیـرە نەوتیـان دا بێچووەکانیـان بە دیـاری

درۆزنبـوون لە گەڵ کەلتـوور و زمـان و مێـژووی کـوردەواری

کـۆن لە گونـدی و نـوێ لەشـاری بڕەویـان دایە چەتەگەری

ئاگـات لێـیە چـۆن ئومێـدی ڕەنجـدەرانیان تەفـر و توونـکرد؟

هەرچی جوانی و قوربـانی ئەم خەڵـکەیە گشـتیان هەپروونکـرد!

ئاگات لێیە هەرچـی دوژمـن پێـی نەکردیـن پـێ مانییان کـرد

زۆر بە بێبـاکی و ناپـاکی و بـێ بەزەییـانە و دەسـت و بـرد

بە سـەر پشـتمان پەڕینـەوە و بەکاریـان هێنـایـن وەکـو پـرد!

٢٠١٧/٢/٦

**بروسکەی دووەم**

ئاگات لێیە ڕەنجبەرەکەم

شۆڕەسوارە جەربەزەکەی هەولێرەکەم

شـاعیرە بەرگریکارەکـەی ڕەنجـدەرانی نەتـەوەکەم

هـاوڕێ فەرامۆشـکراوەکەم هەرگیـز لەفیکـرم دەرنـاچی

بەنـاو خـوێنی دەمارەکـانی جەسـتەمدا دێیـت ودەچـی

وادەزانـم مـن کـاک جەمیلـی شـەهیدم ! تـۆش سـابیری!

دەڵێی کت و مت ڕەنجبـەرم

بە ژانــــی ئەو زامە قـــووڵەت لەجــــەردەکان بە خەبـــــەرم

بەهـــزری شـیعری بەرگـــری کـــاکی مامۆسـتـــا و ڕابــــەرم

لێـرە لەم خـــاکەی کە خۆتـــان بەشـــانازی بـۆی بەکوشــتدا

حـــاجی ســـاڵح لەچـــاوەڕوانی پێشــــمەرگە و ســــەرکەوتنا

بەداخی مەرگی تۆ و یاسین دڵی وەستا

دایەئاسک جەرگی سووتاو بەو مەراقە

سومـای چـاوەکانی لێڵ بـوو هێندە گریـــا

بەو کەسـەرەش جەڵتـەی دڵ و مێشک لێیدا

ئەو نیشتمانەش کە تۆ خۆت، بۆی کرد فیدا

بۆمان بوویتە خەفەتستان

ترسـم هەیە پـــڕم داتـــێ ناکەســـبەچەی جەنگەڵســـتان!

ئاگـام لێـیە تـۆش بە ڕۆحـت ئاگـات لێیە؟پـاش مەرگـی تـۆ

چەنـدین جـار یەکتریـان قڕکـرد کـەوتینـــە واوەیـلاو ڕۆ ڕۆ!

ئاگـام لێیە بـــە چـــاوی دڵ دەیـان بیـنی چۆنـــن ئـەمـــڕۆ؟

چییـــان بەســــەر ئەوخەڵـــکە هێنـــا؟

خـــێڵگەری و یاســـا شـــکێنی و برســـی کردنییـــان داهێـنــــا

دزی وفـــزی و مـــۆدەی حیزبـــی بەرژەوەنـــدچییان هێنـــا

بـــوونە پەنـــای فیکـــری ڕزی و دەمـــامکی مەڕیـــان لەســــەرنا

بێچـووە ڕێـوی و گـورگی هاریـان لە سـەر تۆقانـدن ڕاهێنــــا

بـــــرەویان بـە ڕەوشـی  تـــاڵانی مـافیا دا

تابەچکەی زۆڵی شەیتان بێ خۆی پەنادا!

تـــاریکی و سەرمایان کـــــردە  خەڵات بۆ ڕۆڵەی نـەداری

خەمـۆکی و مـووچەبڕین و کۆچیـان بـۆ کـردین بە دیـاری

چـی دوژمـن پێـی ڕانەگەیشـت حیزبـی نالەبـاری کـوردی

کـۆیلەپەروەر، بـێ پـەرواو نـەپـەنگرانـــەوە هـــات و کـردی

چی سومبولی جوانی و خەبـاتی شـاخ هەبـوو هـات وبـردی!

لەشکری خێـڵ هـاتە مەیـدان  بـزر بـوو پێشـمەرگەی مەردی!

پەنگرانەوە:سڵەمینەوە

۲۰۱۷/۲/۱۰

**پرۆسکەی سێیەم**

ئـاگات لێیـە؟

ڕەنجبەرە دڵ پڕخوێنەکەم

شەهیـدە شۆڕشڤانـــەکەم

پێشـــان لە نـــاو گۆرانیەکـــان  لە کۆبـــوونەوە نهێنیەکـــان

پێیـــان دەگـــۆتین کە حیـــزب  ئـــازادکەری خەڵـــک و خـــاکە

یـــان دەیـــانگۆت:حیزب بـــاوکە بـــۆ ئەو منـــاڵەی بـــێ بـــاوکە

حیزب لانکە بۆ ئەو مناڵەی بێ لانکە!

کەچی ئەو حیزبانـەی ئێستا

پووشیان لە پشتی گەل بەستا

ڕەتانــدن بــوویتە میتــۆدی  حیزبــی نــدی و بــدی کــوردی
دەڵەچەیــی و خەڵەتانــدن، بوویتەســیمای  ڕاوەڕووتچــی
بــێ مـۆڕاڵی بــوویتە ئاسـتەنگ، لەبەردەم ژینــی جـوانمەردی

ئاگات لێیە؟
دوورلە بنەمــای مــافی ئینســان  چــۆن نەداران دەڕەتێــنن
خەڵــکە لەڕو لاوازەکــان لە ژێــر قــــامچی دادەڕزێــنن!
خێرا گورگان خواردییان دەکەن!
تاڵاوی حوکمێکی سەقەت بە گەل دەدەن!
جاشولکەکان لە خۆڕایی جۆتکە داوێن
پێشمەرگە ڕاستەقینەکان پشتگوێ دەخەن! لەکونێ داوێن!

پێشان سیاسەت و تێکۆشــان ئــەوها نەبــوو!
لای تۆ باوەڕ سەر مەشقی ئەو مەیدانــە بوو
دەبووایــە ئەنــدامی حیـــزبی  خزمــەتی خــەڵکــی کــردبا!
بــۆ ڕەش و ڕووت و بێـچــاران  ببــوایــە بــە پشــت و پەنــا!
ئێستاش تــەواو لنگاو قـــووچە  بەرنامەیـان کــاری پــووچە
دەبێ خەڵک بۆیان هەڵپەڕێ و شوکور بێ  بەرجەڵـدە نەدرێ!

دەبێ کادیر! حیزب ویست و پوول پەرست و دژ خەڵکی بێ!

دەمدووراو و دەست لەسەرسینگ! هەرخەریکی بێدەنگی بێ!

یان خەریکی هەڵەوەڕی و خۆبردنە پێش مەرایی بێ!

ئای کاکی خۆم چیت بۆ باسکەم ؟کەوتینە ژێر ڕکێفی خەم!

ئەمڕۆکە یەکجار بێزارم پلیشاوەی بن پێی زۆردارم

یاسای بەناو حوکمی خۆیی داندراوە بۆ غەدری خۆیی!

کێی خاوەن ڕەوشت وعەردە

ئەوەی وڵاتپارێز ومەردە

دەبێ لەژێر فشاردابێ دەستەمۆی گەماڵ وحیز بێ

وا خەریکە میللەت تێکڕا خۆزگەیان بە کفن دز بێ!

حیزبایەتی و مەردایەتی ڕۆژانی زوو باوی نەما

ئەوەی بۆ خاک وگەل دوێنێ شەهیدبووە و قوربانیدا

خەڵکی یان بەخەشیم یان بەفیڕۆی ڕێی حیزبی ناودەبا!

وەک ئاردی ناودڕک و بەردەمی ڕەشەبای حیساب دەکا

هەندێک پێیان وایەو دەڵێن لەڕێی هیچ دا، تێچوو فەوتا

ئاگات لێیە، ئاگات لێمە، لەم ڕۆژگارە چیمان لێهات؟

دۆش داماوم دەبێ تا ماوم بگریم بە داخی وڵات!

٢٠١٧/٢/١٧

**چوارینەی خەیام★**

جـــارێکی گـــۆزەیەکم کـــڕی لە گـــۆزەگەرێ
گۆزە هاتە قسەو نهێنـی خـۆی وا دەردەبـڕێ؛
شاهەنشاهێ بـووم وجـامێکی زێـڕینم هەبـوو
من ئێستێ بوومەتە گـۆزەی هەر شـەڕابکەرێ

★وەرگێڕان لەفارسییەوە

**جامی شەڕاب**

یەک جامی شەڕاب، سەد دڵ و سەد دین دەهێنێ
تەنیا قومێک مەی، سەراپای وڵاتی چین دەهێنێ
جگە لە لەعلّی سووری بــادە، نییە لە دنیــادا
تاڵییەک هەبێ، کە هەزار گیانی شیرین بهێنێ!
چوارینەی خەیام
وەرگێڕان لە فارسیەوە
٨/ ١٠/ ٢٠١٨
لەعل: یاقووتی سوور

**چوارینە ؛خەیام**

واهەور هـات و ئەسرینی باراندە سەر ســەوزە گیا
بێ مەیی گوڵڕەنگی دەمی ئەوهەرگیز پێی ناڵێن ژیا
ئەوسەوزاییەی ئەمڕۆ کەوا جێی تەماشای ئێمەیە
تا ســەوزی سەر گۆڕیمە، داخوا تەماشاکـەر کێیە؟
وەرگێڕان لەفارسییەوە

## ڤیستیڤاڵی ڕەنگەکان یان تەفرەدانی لاوان؟

ئای کەپەروەردەت سەقەت بوو
وڵاتمــان بەدەســتی براکــوژی ملهــوڕ لەتبــوو
لاوانــی ســەرلێشێــواوی! گەوجێنــدراوی!
بــۆ فیســتیفاڵی عەشرەت و ڕەنگەکــان بەفەتــارەت چــوو
ئــەوەی هەمانبــوو و نەمانبــوو لــەکیسمان چــوو
کوا ویژدانی مرۆڤی زیندوو؟
کوا ئیرادەی گەنجی چاوکراوە و پێشکەوتووی ڕۆژانی زوو؟
هەیهوو هەیهوو
ئەمرۆ کاتی تـەفرەدانـە کێ فیکری لای نیشتمانــە؟
کوان کوڕانی وەچەی پێشوو؟
بــگەن بەهانــای بەرکەوتەی لافاوەکــەی ڕۆژهەڵاتــێ؟
ئەمــڕۆ لە نــاوقوڕ چەقیــوە و بێــدەرەتان کەس نایگــاتێ!
ئەریێ چ زوو لەبیرتــان چــوو؟ هەیهــوو هەیهــوو!
ئەوخەڵــکە چــۆن مێشــکی بە تڕووهــات پڕبــوو؟
بــەرەوکوێ؟ دڵــمان لـەڕەنــگی ناپەســەندتان پڕاوپڕبــوو؟
ئــەرێ بەراودێ بکــەن! کێــی ویـژدانــی نــەمردووە؟
یــان تــازەهیچ! هیــوای گــۆڕین، لەم دەڤەرەبەســەرچووە؟
مــن بێئومێــدم لــەم نــەوەی چــەتە پەروەردەی کــردووە
ببــوورن گــەر پێتــان وابــێ ئــازادیم پێــشێــل کــردووە
تاســەر ئێســقان منــیش ئــازادی پــەروەرم
لەپاشــکەوتوویی کۆمەڵگــەم بـەخەبــەرم

بەڵام نەک وا گەل وخاکتـــان لـــێ ونبـــووە
مێژووی خۆتـان، ڕەنـگ و سـەنگتان لە بیرچـووە
گەنـج دەبـێ گالیسـکەی زانسـت پـاڵ پێـوەنێ
داهێنـــان کـا، کۆنـــەی چـرووک بـــەلاوەنێ
نەک خەریکـی خـۆ گێـل کـــردن ! دارمــانی بـەهــاکان بـێ
نەک لە ئاسـتی نەهـامەتی ژینـی خـۆی دەستەوەسـتان بـێ
بـاوەک سیزێـــف نـــەبەرد و بنیـاتنەری پێنـــاو ئینسـان بـێ
یـــاوەک پەلـکە زێرینـــە شـیتەڵ کەری ڕەنـــگی بـاران بـــێ
دەڵـێن گیـا لەسـەر پنجـی خـۆی دەڕوێـتەوە
گەروایە چـــۆن؟ ئێـــوەی بـــۆ لێکەوتـــۆتەوە؟!
یان من هەڵــەم لەم بۆچـوونەم؟
دوێنێکـــەش هـــەر ئـــاوا بـــووە؟
تەنیـــا هەر بـــاو وبـژبـــووە! هەرچـــی بـــووە؟
تەنیـــا توێژێــک خەمـــی گشـــتی هەڵگرتـــووە
ســـەرگەردان و لە نـــاوچووە !ســـووتماک زینـــدەبەچاڵبووە
بەری ڕەنجیـــان خـــوراوە یـــان وەک داری ژاڵە تـــاڵبووە؟
وەک زینـدەخەو بەتـــاڵ بـــووە!
وەک حـــاڵی مـن بێحـــاڵ بـــووە!

٢٠١٩/٤/٦

## ئەنفالی دارستان

"لەداخ تاڵانی دارستان لەلایەن داگیرکەران"

ماوەیەک بوو بێتاقەت بووم بڕیار بوو چیدی نەنووسم
داری سەربڕاوی ئەم خاکە خستیە ناودەستم، پێنووسم!
وا دارستانی چیاکانی کوردستانتان ئەتک دەکرێن!
بێزەحمەت پارێزەرانی ژینگە و ئاوو خاکمان لەکوێن؟
دارەکانمان گوناحیان چییە؟ بۆ لە سێدارەیان دەدەن؟
گەر پێشمەرگەی ڕاستەقینەن! بۆ ڕیسوایی قەبووڵ دەکەن؟
ئەوەی ئێستا دەگوزەرێ بەردیش دەهێنێتە وەڵام
تفی سەرهەورازیش بێ هەر دەیهاوێم تابەسوێ بێ زام!
چ نەنگییەکی سەرسوڕمێنە؟شەرەف ببرێ و پێ میم هەڵێ!؟
مێژوومان گەر زمانی هەبێ ! بۆ ئەنفالی خاک چ دەڵێ؟

سالی ئەنفالی داری چیاکانی کوردستان

## قەڵەمەکەی جەمیل ڕەنجبەر

"بۆ سی ونۆهەمین ساڵیادی شەهیدبوونی"

سـی و نـۆ سـاڵە ڕەنجـبەری شـەڕڤانی کـوردم خەوتـووە
بـۆ چـرکەیەک قەڵەمەکەی لە بەرخـودان نەکەوتـووە

قەت لەیـادی ئەو هـاوڕێیەم مانـدوونەبووم چـون زینـدووە
کەس نەڵـێ ڕەنجـبەری کـوردان کوردسـتانی لەبیرچـووە؟

ئەو جەمـیلەی بەبـوونی خـۆی قوربانیـداو بۆخـۆی نەژیـا
ویسـتی گەلەکەی ئـازاد بـێ لەسـەرخاکی چیـا و کەژیـا

بەڵام ئەفسـووس، هەنـدێ بـاڵاکورتی وڵات لە بیریـان کـرد
ئەوشاعیرەی خەمی گشـتی لە کۆڵبـوو بـۆ گەل بـوو بەپـرد!

ئێسـتاش ئەو هەر بە خەبەرە و ئـاوەزی وەک جـاران وایە
هێشـتاش ئەو هەر تێدەکۆشـێ و گیـانی شـەیدای ڕۆژئـاوایە

ڕۆحـی ڕەنجـبەر بەرز فڕیـوەو لای کەرکـووک وگـرێ سـپییە
هەر چـوار پـارچەی دڵـی ڕەنجـبەر لە سـەنگەری بـەرگرییە

٢٠١٩/١١/٩

## زامی ڕەنجبەر

ئەمــڕۆ زامــێکم دەربــووە لە ڕەنجــبەری ئێــوە دەدوێ
داربــەڕووێک کۆستیکەوتووە! دەڵــێ ڕەنجبەرتۆهـای لەکـوێ؟

گرێــک دڵمــی لەتکــردووە جەمیــل تیــا گڵــپەی ســەندووە!
ئەو بــرینەم زووخــاوی لێـدێ دار و بەردی هێنـایتە ســوێ!

٢٠١٩/١١/١٨

## ئاڤێستا

"٢٠١٨ ئەو وڵاتپارێزەی لەمردن سڵی نەکردەوە"

لە دوای گیانبــــازی ئەو ئاڤێســـــتایە، ئەو کیــــژە بـــــوێرە
کــــوردێنی هەمـــووان لە ژێـــر پرســـیارە و درۆی ڕابــــوێرە!

ســــەرەنگرێ بــــوونی نێــر ســـــالارییەکی چەتەی نــــامێرە
ئەو گوڵئەســـــتێرە پەروەردەی خاســـــی ڕۆژاوای دلێــــــرە

بەرگری عەفرینێ دۆست ودوژمنــی گشــت تووشــی شــۆککرد
مێژوویەکــی نــوێی پــڕ لە مــۆڕاڵی نووســیەوە بــۆ کــورد!

# من و پایز

هەر چەنـــد پـــایز لام خۆشـــترین وەرزە

گـــەڵای وەریـــوی ڕەنگـــین و تـــەرزە

کە پایـــز گەرمـــای هـــاوین جـــێ دێڵـــێ

بـــای فێنـــک دەدات لە گەردەن کێـــڵێ

لە گەڵ ئەوەش بـــۆ مـــن گشـــت پـــاییزێ

یـــادی دابـــڕان دێ گیـــانم دەشـــەمزێ

ئەوعەشـــقەی بەهـــار لای دڵ مێـــوان بـــوو

لە پایـــزێک ڕۆیـــی وێـــڵی کێـــوان بـــوو

ئـــــەو گەڵا زەردەی ڕژاوە لە زەوی

خۆشحاڵـــە جـــوانێ بـــڕوات بە نـــاوی

هەنـــد جـــوان دەنـــوێنێ گەڵاو بەژنـــی ئەو

کە خـــۆر لێـــی دەدا پـــێش تـــاریکی شـــەو

ئەی دڵ تـــاکەی ئەو هـــا بـــێ قەراری؟

بە پایـــزان نغـــرۆی پەســـت و بێـــزاری؟

ئەو زامـــــە قووڵـــــەم لە بیـــر نـــاچتەوە

مـــەگەر مـــەرگ بـــێ و ڕەشـــم کـــاتەوە !

یـــاخوا کەس وەک مـــن جەزرەبەی پـــایزان

نـــــەکێشێ دەردی دووری ئازیـــــزان

ئەو وەرزە جوانـــە بەس بـــۆ خۆشـــی بـــێ

گـــەشت و ســـەیران و بـــادە نۆشـــی بـــێ

هەولێر ٢٠٢٠/٩/٢١

دەشەمزێ : دەژاکێ

## بەتەمبەڵی و بەگەندەڵی

شیعری: گەپ

بە تەمبەڵی و بە گەندەڵی و بە بندەستی لێدە عەلۆ !

عیللەتین حیزبی دۆڕاوین تێکشکاوین بنووە و بخۆ!

بەخۆشی یان بەناخۆشی، وەک کەری بار، لێتان دەخورین!

هەر هاوارکەن بڵێن تاکەی پێمان ڕادەبوێرن وەتۆ؟

پێشڕەوێکی خۆسەپێنین

ئاویٚ بینەو دەستان بشۆ!

شەل و گێڕین و چەکدارێکی بەزەڕین، بە کەیفێخۆ!

یان ئۆینلەرەم یان زیفلەرەم! تا مابین هەرئێوەن پەڕۆ!

لەکەیف وسەفا ناکەوین، لەبنەوەش بین هەرناکەوین!

دیکتاتۆرین لە جەوهەردا، دیموکراتینە بە درۆ!

لە تەزویر و پیلانگێڕی و هەڵیٚ هاتدا، کول فیکولین!

کاری ئێمە لنگاو قووچە !خۆمان شێر و ڕێوی و فیلین!

هەیدۆ هەیدۆ! لێدە تەعۆ

دەتانئاژۆین بەبیٚ مووچە شەوو ڕۆژبکەن باوکەڕۆ

با گەلیش بمریٚ لە برسان نەیبیٚ نانی هەرزن و جۆ

کیٚ دەڵیٚ ئێمە کۆڵ دەدەین لە چەوساندنەوەی خەڵکیخۆ؟

هەیدۆ هەیدۆ بڕۆ باژۆ!

کوردستان مانگای شیردەرە

دایدەدۆشین، دەیخۆین وەک شیری دایکیخۆ!

بەشــی مــیللەت خــواردنی ئــێکس پــایەرە و ژەهــری مــارە
ڕیســواو دەمکوتمــان کــردووە و ســاڵ دوازدەی مــانگێ بێکــارە
لێــدە فەعــۆ! هەرچــی قــازانجی خەڵکــی بــێ ئــێمە نــایکەین
بازرگــانێکی هەڵــپە و بــێ پرەنســیپ و یاســا و ڕێســاین!
کــێ بەرامبەرمــان بوەســتێ میــدیای نــەفتــاو ڕاوی دەکــات!
خەفــیەی ڕاپۆرتنووســی گــڵاو تیغــی گــواو ســواغی دەدات!
هــــەواداری ئەدەبــــسزی مێشــــک شــــۆراو تێــــبەردەدەین
پێ وخۆشبی و پێتان ناخۆشبی کەڵەگای ئێوە هەر ئێمەین
هەر ئێمە شایستەی سەری کــــزۆڵی بێ زاخــــی ئێوەین
ئێــمە چــاکســازی درۆیینــە و پــێ ڕابوێــری دۆنــەدیــوین
فشقیات خــوازی کــورت بــین و ناســەنگینین! دەبــێ هەبــین!

بــڕۆ، بــاژۆ

هەیدۆ هەیدۆ لێدە عەلۆ

بــا خۆمــان دەســتەبالا بیــن خەڵکیش بــا بــکات بــاوکــەڕۆ
کــێ دەڵــێ ئــێمە کــۆڵ دەدەیــن لەگــەوجاندنی گەلیخــۆ؟
ئێمە سوار و ئێوەش پیــادەن نەوەی نەوەشــمان بەگــزادەن!

هەولێر ٢٠١٨/٢/٢٥

## دوکان سوتاوێکی لەنگەی هەولێر

دیسـان سـووتاوە مـاڵ وحـاڵەکەم
لە قـوڕ چەقیـوە ژیـنە تـاڵەکەم

بەسـەت قەرز و فەرز کـونجێکم کـڕی
تـا خـۆم دەربـاز کەم لە قـات و قـڕی

کەچی نیـوەی شـەو دەسـتێکی بەدفەڕ
مـاڵی ئـاگردام دەرکەوت خێـوی شـەڕ

لەنـگەی هەولێـرێ گـڕی تێـبەر بـوو
دار و نەدارم گشـتی لە کـیس چـوو

جەرگـی سـووتاندم ئـاگری نەگـبەت
بـاڵی شـکاندم بیـرم نـاچێ قەت

قەدەرێـک سـاڵە هەولێـر خەمبـارە
وەتـی گەنـدەڵچی هـاتتە ئەم شـارە

خێـر و خۆشـیمان لە خـۆ نەدیـوە
خەومـان بە جـارێ لەچـاو فڕیـوە

بـازاڕی لەنـگەی خەڵکـی سـووتاوە
نەگبەتـی بـۆتە بەشـی چەوسـاوە!

دیســان گــڕی گــرت لەنــگەی هەژاران
تــا پــڕ هەڕمــێن بــۆ مــۆڵی پووڵــداران

ئەوە چەنــد جــارە لەنــگە گــڕ دەگــرێ
خوایەکەی هەقــی مەزڵوومــان دەکــرێ؟

دەڵێــی دەســەڵات تەمــاحی تیــایە؟
پێــی شــایەن مــۆڵی بەگــزادەی شــایە؟

دڵ پــڕ زووخــاون زۆربەی ئەم خەڵــکە
گەرحــوکمەت هەبــێ قەرەبــووش ئەرکە!

هەولێر ٢٥ / ١٠ / ٢٠١٨

## پاش هەرەس

بەتەمای چیت ؟ پاش ئەم هەرەس و خیــانەت و سەرشــۆڕییە
بێگومــان لاوک و ســەردولکە بــۆ مردنــی جاشــک و تــۆڕییە!

ئەوان لێــرە خــاوەن مــاڵن !ئەوهــا ڕەگیــان داکوتــاوە
شــەهید و وڵاتپــارێز ناویــان، لە کــوولەکەی تەڕ نەمــاوە!

هەولێر ٢٠١٩/٧/٢٥

## شیعرێك بۆ موحەمەد ڕەسوڵ ی هاوڕێم

بیرمە ئەوجارەی پێت گوتم گشتمان مردنێک قەرزارین
بەڵام خۆشە پاش مردنیش لە دڵی میللەتدا بژین

دڵتم دایەوە و پێم گوتی خوا نەکا بەو ڕۆژەی کاکە
گوتت بە خوا لێم نزیکە و مردن دوژمنێکی چاکە

چاک نییە تۆ گەر بشمری ناوەکەت دوای خۆت دەمینێ
بەڵام من بمرم کێ ناوی موحەمەدی بیر دەمینێ؟

دڵم دایەوەو پێتم گوت؛ مادام لەکین هەر دوو یەکین!
کوا ئێستا کێ وەفای ماوە؟ ڕۆڵەی گەلێکی بەدبەختین

خوا نەکا تۆ پێش من بڕۆی بتلاوێنمەوە بە شیعرێ
تۆ شایەنی تا هەتایێ ناوت لە مێژوو بنووسرێ

چەند بۆم بلوێ لە پێهەڵدانی جوامێریت، قسووری ناکەم
کە لە وەسفا بۆم داڕێژرێ لە شیعرێکما پیات هەڵدەدەم

مامۆستای کۆڵنەدەر قەت ئەو یادگاریەتان لە بیر ناکەم
کە ڕەنجبەر شەهید بوو گوتت خۆزگە من بەو پلەیەی بگەم!

خوات لە گەڵ هاوڕێی بێوێنەم هەتا مابم هەر لە بیرمای
نوکتە خۆشەکانت لە دڵ نەخشێنراوە و لای من هەر مای

هەولێر ٢٠١٩/١٠/١

## سروودی بەرگری لە خاك شەرەفە

گــورگە دەمبەخــوێنی کــورد هــی جــارانە
گەف دەکـــا لە ڕۆژئاڤـــای کوردســـتانە

ڕابــن هەرچـــی مرۆڤـــی خـــاوەن ویـــژدانە
مەهـــێلن کـــورد تەنهـــابێ لەم مەیـــدانە

گەلــۆ دەی بــا لەمــڕۆژە پشـــتی یەکبـــین
لە ســـەنگەردا بـــۆ بەرگـــری پـــڕچەکبین

بەرگـــری لە خـــاک شـــەرەفە و فەرمـــانە
گەلـــی ڕۆژئـــاوا وەختـــی بەرخـــودانە

ئیـــرادە مـــان چەکـــمانە مـــان و نەمـــان
ڕابـــن چ جـــار هێـــزی گەل خـــۆی نەچەمـــان

کەڵـــبە بە خـــوێنن دژی مرۆڤـــایەتین
عەولەمەی بەدرەوشـــت پشـــتی تێکـــردین!

ڕۆژی مەردێنـــــی و بەرگـــری لە ژیـــــنە
چـــاوی دایکـــی شـــەهید پـــڕی ئەسریـــنە

هەرچـــی کـــوردە لە ســـەریەتی پشـــتگیر بـــێ
دەنا ڕەنگبێ نـۆرەی "کـش" لەویـش گیـر بـێ!

کەینـــێ جەنگســـاز بـــردیتیەوە؟! خـــوێنڕێژە!
هەر دەدۆڕێ، چـون فاشیسـت، بیــر قرێــژە!

٢٠١٩/١٠/٧

## حوشتر

کەر ئێستابچتە بەغدایێ زۆر پێی عەیبە ببتە هێسـتر!
ڕەنگی کەرێش هەڵنـاگرێ بە ئاسـانی دەبـتە حوشـتر!
ڕابردووی خۆی ئینکار دەکا لە هێسـتریش ڕەتـی دایە!
کورتانەکـەی فڕێدایە و خۆی پێ شایەن تەختی شایە!

هەولێر ٢٠١٩/١٠/١٠

## جاشکی قەڵەم بە دەست

ئەورۆ جاشـــکی قەڵەم بە دەســـت! لەم وڵاتە گەلـــێ زۆرن
پاتاڵچی و گەندەخۆر دژی، هەق و جوانی و تیشـکی خـۆرن

گیرفـان پەرسـت و سەرشـۆڕیزم و بەدفەڕن، دژی شـیعرن
لە بن پێی شای شەمووله وەک سیسرکەو مارمێلکە دەمرن

هەندێ لە نـاو شـیعری چـرووک دێـزە دەکەن بە شـازادە
زۆر لەکەرێش ئەولا تـره، وەک گای هـار تووشـە بەر بـادە!

دوا ڕۆژ هەر بۆ شیعری ڕەسـەن ئەنتـی زوڵـم و بەرگـرییە
خـائین ئەوسـا کە تـڕۆیە ئەسـتێرەی گەل لەبەرزیـیە

هەولێر ٢٠١٩/٩/٢٩

## شەیدای تیشکی خۆرەتاوم

ئەم چەنـد دێـرە سـەرپێییەم لەچـاوی فـاڵچییەکە نووسـی!
ژیـنم پـڕ دەردە سـەری بـوو خۆشـبەختی لێمـی نەپرسـی!

ڕاسـتە بەعەشـقی نیشـتمان گیـرۆدەی خۆنەویسـتی بـووم
بەچـاوی هـاوڕێتی و وەفـا بە پیلـی خۆشەویسـتی چـووم

بـێ غەل و غەش لە سروشـت و هـاوڕێی تەمەنـم دەڕوانـم
دوورم لە فیکری شـەڕانی و بەرپـێنە و فێـڵ لە ژیانـم
خـراپەی هـیچ کەسـێ نـاخوازم لە خزمەتـدام تـا دەتـوانم

بەدڵسافیی و بێدەستی خـۆم گەر هەڵەیـەک لێمرەت بـوو بێ
یـان کەسـێ بە گـوێرەی میـزاج لێکـدانەوەی سـەقەت بـووبێ

بـە لا ملی یـان بە ئـەنقەسـت قۆسترابێتـەوە لای هەندێ
بێ ئینسافی نەکرێ هەردەم خاوێن بووم وەک شـەکری قەنـدێ
لە خزمەتـی گشـتی دابـووم لە ڕێـی ئەوان بـووم بە پەنـدێ

خەڵکێـک بەنـاهەق گەر هەشـبێ تەقەی هەوایـیم بـۆ بـاوێ
ڕێـی هوشـیاری گەل بەرنـادەم نـاهێمە دواوە هەنگـاوێ

واش تـێمەگەن لەخۆبـاییم  خۆشـبەختییەک ڕووی تێکـردووم
وەتـی هەم لە  نـاو  مەینەتـی  سـتەمدیدەکاندا  نوقومبـووم

مـن  لێـرەوە  بە دڵێکـی  بـێ  غەش و  پـڕ لە  خۆشەویسـتی
هیواخـوازم هـیچ هـاوڕێیەک  نەبـتە  بەنـدەی  خودپەرسـتی

هەر کێـی  منـی ئـازار دابـێ  بـێ چەنـدوچون  لێـی  دەبـوورم
شـەیدای  تیشـکی  خۆرەتـاوم   دژی شـەوگاری  نـاجوورم

خـۆم  بە  بەخـتەوەر  دەزانـم  عـومرم  لە ڕێـی  هەق  بە بـادا
بـۆ  گەل  پەشـیمان  نـیم  مەڵـێن  سـابیـر لەم  ڕێبـازە لادە

٢٠١٩

# نارەزایی خانەنشینی ڕاستەقینە

خانەنشـــینی ڕاســـتەقینە کە چـــل ســـاڵ لە خزمەتبـــووینە
بەم ڕەشنووســـە! سەگسـۆنیاییەٌی حـوکمەتی گەوج ڕازی نیـنە!

چـون بـۆ خۆیـان مـووچەی قەبەو زەبەلاحیـان شـەرعاندووە!
مامۆســـتاو فەرمـــانبەری خـــاوەن خزمەتیـــان لە بیـــر چـــووە!

کوانێ ئـــــــــەوەچاکسازییە؟ ناهاوسەنـــگ و لاپرەســـەنـــگە
خانەنشـــینیش نـــاڕازییە، مـــافخوراوەو دڵـــی تەنـــگە

هـۆی پەرلەمان!پەســـندمەکەن پیسکەیاســای ئەم حـوکمەتە!
گەر نـــوێنەری گەلـــبن دەڵـــێن: چاکســـازییەکەتان ســـەقەتە!

گەر ڕاست دەکەن چاکســازی لە مـووچەی خانەنشـینان دەکەن؟
یاســای ژمـارە نـۆی بەغـدایێ بـۆ خـاوەن مـاف بە کـار بـخەن

٢٠١٩/١٢/١٥

سەکسۆنیا: هەرێمێک بووە لە ئەڵمانیا، یاساکانی لە خزمەتی دەوڵەمەندەکان بووە.

## قەل

دەڵێـن قەل بــە قەلێ دەرێ

یاخوا ڕووت وەک تەنی ڕەشبێ

گزیـــــکار بەهاوشانی خۆی

قەیناکە تۆش چاوت گەشبێ!

٢٠١٨

## هەولێر

وەرن سەیرکەن چۆن لەجێی شێران

چەقەڵ و ڕێوی لێی دەکەن گێران!

ئاخ کە نەیمـاوە گوڕاحـی شـادی

کوا هەولێرەکەی شاری جوامێران؟

٢٠٢٠

گوڕاح : کەیف

گێرە:جەنجەڕکردن

## دەسەڵات

ئەو دەسەڵاتە چەند چاو چنۆکە

مووچە دەخوا وەک گەزۆ و شەکرۆکە!

قـەت بێـزار نابێ لە درۆ و دەڵەسە

کوسکێشـی زۆرن دەوەڕن وەک سە!

٢٠١٨

## تروسکایی

"ئەم چەند دێرەپێشکەشەبە مامۆستا ئیدریس دیبەگەیی "

شـــەهیدەکان ڕۆیـــین تـــازە هیچیـــان ئـــاوڕ نـــادەنەوە
نە ڕەنجـــبەر مـــاو نەحەماســـەتی کـــوردێنی و نەخوێنـــدنەوە

نە شـــانۆگەری و دڵخۆشـــی نە شـــەوگاری بـــادە نۆشـــی
زەمـــانەی بەد، حـــوکمی گەنـــدەڵ ئەوڕۆ بـــێ هیـــوایی پۆشـــی

بەڵام هـــاوڕێم بەچـــاوی دڵ دەبیـــنم تروســـکاییەک مـــاوە
ئەوەی ئێســـتا دەگـــوزەرێ داهـــاتووی لێـــڵە گومنـــاوە

ژیـــان بەرە و پێشـــکەوتنە نـــابوودیش بـــۆ چەوســـێنەرە
دواڕۆژ هەر بـــۆ ڕەنجـــدەرانە خەڵکـــی مەرد و کـــۆڵنەدەرە

بەشـــادی و خۆشـــی بتبیـــنم هەتـــا لە ژیانـــدای مـــاوی
تێچـــوونی زاڵـــمان ببیـــنین بە ملشـــۆڕی بە ترشـــاوی!

ڕاســـتە ئێســـتاکە هـــاڕدراوین بارمـــان لەنـــگە و مـــافخوراوین
چـــون ســـەربەرزین بـــڕوابکە ئەوان مـــردوون ئـــێمە مـــاوین!

ئەیلول ٢٠٢٠

## بۆ ڕەنجبەرێك برینەكەی چڵ ساڵە خوێنی لێدەڕژێ

ئەو برینە هی ڕەنجبەرێکە چل ساڵە خوێنی لێدەڕژێ
قوربانی کوردستانێکبوو هاوزمان خوێنی هاوزمان دەمژێ

داخی براکوژی و کوردکوژیش وەک کۆڕۆنا بینی گرتووین
نا عەدالەتی و برسێتیش بەرەو بێئومێدی بردووین

خەڵکی هەند جەزرەبە دراوە گەل وخاکی لە بیرچووە
شەهیدی چی؟ڕەوشتی جوانی کوردەواریش تێکچووە!

نابینم کەس گوێ بگرێ لەو خەونانەی تۆ ئەوسا هەتبوو؟
لێرە خیانەت باوەو دەڵێن فیداکاریت بە فیڕۆ چوو؟ !

کە لەگەڵ جەماوەر دەدوێم بە پارێز ناوی تۆ دێنم
نەک پێم بڵێن کۆنە کاچی ! تا کەی وازت لێ ناهێنم؟

هەستی زامدارم هێشتابۆ ئەوخوێنەڕژاوەت دەگرێت
کە ئازادی لێ شین نەبوو ! چەتەش تەڕاتێنیە لە جێت!

گەر دەسەڵات خوێی بەسەر ئەم زامە کۆنەم دانەدەکرد
من چیمدابوو لە شینگێڕی ؟ ژیانی خۆمم بە سەر دەبرد !

بەڵام چیبکەم کە ڕەنجبەرم لە هەژدەی یازدەی هەشتاوە
جێیهێشتووم، خەم لە سەرخەم دێ، یەخەی منی بەرنەداوە

٢٠٢٠/١١/١٠

## ڕیشەی غەدری ئەم سەدەیە

"سەروەختی پەتای کۆڕۆناو کەرەنتینە"

لـە دوو هەزارو بیست سابیـر دڵ غەمبـارو حەپـەساوە!

نـازانی بـۆ؟ شیعر دەرگـەی داخستووە و لێی ڕەنجـاوە؟

هەندەی شیعری تووڕە و ئامۆژگاریم بۆ ئەم خەڵکەنووسی

هـەر دەمگۆ بێدار ببنـەوە! گەندەڵان دەرکەن بە لووسی؟

عومرم لەحەفتا لایـداوەو لەمەودواش پێـم دەڵـێـن پیـرە

ئـێـرەش پڕ لـەستـەمکاری و دوژمنی جوانی و شاعیرە!

هەرچەند هێشتاش بەدڵ و بەگیانم گەنجم، دیارەمـاوم!

کەچی جەستەم شەکەت و بێ هێـزەو شوکور نەچەماوم

جگە لە کۆڕۆنای سەگسـار ڤایرۆسی چەتەش سەربـارە!

خـەم لەسەرخـەم هەڵچنـراوە! ڕێـزی زاڵم بۆیێ سـوارە!

خەون و خۆزگەم لەبار براوە بەدەستی تاقمێکی چەپەڵ

قرقرتۆکی هیوای گرتووم! هەوری ڕەشی گەردوونی دەڵ!

یـــار لە قەرەنـتـیـنـە دایـە و مـەیـلی جـارانی نەمـاوە

تینی ئەو عـەشقە پیـرۆزەی بە زەبـری هێـز ڕاگــیــراوە

لە خاکی بێ ئومێدان ژیـن سەخت و پڕ گێـــرە و کێشەیە

ئەوەی پێی دەڵێن نیشتمان ڕۆڵەکەی نووستووی بێشەیە!

لەبـەر ناکـەس ژیان بێتـــام و بۆیـــە!چیبکات کەسی مەرد؟

زەوی و ئاسمان لە سەرجاشان تاپۆیە! چیبکات لاوی کورد؟

زەمانــە پشتی شکانـدووم ! غـەدرەکەی لەحەد بـەدەرە

هـــەر کێی خاکپەرو مەرد بێ بێکەسەو قوڕی بـەسـەرە!

جواننووسی و شیعر و ئەفراندن لێرە گشتی بێهوودەیە
تا ڕاپەڕینێک دەرنەینن ڕیشەی غەدری ئەم سەدەیە
هەموو عومرم لەڕێی ئازادی ئەو کوردە چوو بە بادا!
ساقی بابێ هۆشبم سەری قاپێ شەڕابی خەست بادە!

هەولێر ٢٠٢٠ / ٣ / ٣١

# ببنەوە مرۆڤ[٣]

## بەرکوڵ

(ڕێزی زۆرم هەیە بۆسەگ، بڕوابکەن ئاژەڵ دۆستان
بەڵام نەک بۆ سەی بەرەڵڵاو هار و ئازاردەری ئینسان
سەگ بە وەفا بووە و لەگەڵ مرۆڤ ژیاوە لە کۆنەوە
پاسەوانی سەر وماڵی کوێخا و گەدا و جوتیار بووە
وەلێ هەرگیز پاساو نییە بۆ هیچ شاعیرێکی ئەمڕۆ
بێت خۆی بە سەگ بچوێنێ تا دژی گەندەڵ بێتە گۆ
سەگ نایێتە ڕێزی مرۆڤان نە لە ئێستا و نە داهاتوو
هەرچەند سەگە بە وەفاکان چاکتر بن لە مرۆڤی بەدخوو!
چاک بێ وخراپ بێ مرۆڤ هەرمرۆڤە و سەگیش هەر سەگ
شاعیری گەل ئۆقرە ناگرێ مافیا هەڵ نەکێشرێ لەرەگ!)

* * *

وەرن لە مرۆڤبوونی خۆتان بە شێنەیی قووڵ ببنەوە
وەرن بە مرۆڤبوونی خۆتان سەرلەبەری دا بچنەوە
لە ئاژەڵ بوون و زەلیلی و هەڵپەی چروک دوورکەونەوە
گومان لە ئینسان بوونی ئاوەزی خۆتان، بکەنەوە
گیانتان بە ئاوێکی زیوین بێ خڵت و خار بشۆنەوە
گەوهەرتان بە گڕی پیرۆز! لە ژەنگ و تۆز! بسڕنەوە

---

(٣) ببنەوە مرۆڤ، شیعرێکی ڕەخنەییە، دژی هیچ کەسێکی دیاریکراو نییە، تەنها تێڕوانینی خۆمە بۆ وەستانەوە دژی ستەمکاری و پاشکەوتوویی، ڕێزم بۆ شاعیرو ڕەخنەگرەکان هەیە، هەرکەس بەجۆرێ لەشیعری ناوازەو تازە تێدەگا. من پێم وایە مرۆڤ بەرزنترین و پیرۆزترین بوونەوەری سەرزەوییە.

پەرە بە مرۆڤبوونتـــــان بـــــدەن لە نـــــوو پەروەردەی کەنەوە
بەفیکـری ئاشـتی وئـازادی و یەکسـانی ڕاسـت دادوەری سـاغ
نەک بە چڵکـاوی ئیبلیسـان! ببـنە گـویَ لە مسـت، قورمسـاغ!
نەک بە خەیـاڵی پووچێتـــی ئینسـانێتی خـۆ لە بیـــر کەن
چەنگـاڵ و چڕنـۆک، قـولابی وەهمـی گرگنـی، لـیَ گیـرکـــەن
بـۆ بەندەری ژیانپـــەروەری و دەریاچـەی واقیع بێنـــەوە!
لەچڵپـــاوی بەرژەوەنـــدی و خەیـــاڵی پـــووچ دوورکەونەوە
پێتـان دەڵـێم؛ بشـبن بەسـەگ! بشلووریێنـن!دادتـان نـادا
کەس نـاتوانیَ ویـژدان سـڕبووی خـاکی ئـازاردراو پەنـادا
خۆتان بەخۆ دابچنەوە
تـا هەڵنەکێشـراون لەڕەگ، مەبـن بە مەڕ
تـا نەکرێنـە کـۆیلەکی بـیَ ئیـرادە و کەڕ
مەبـن بە جانتـا هەڵگـری نێـرەوزی شـەڕ!
بە پەیڤـی ئـازای شـیعری شۆڕشـگێڕی تەڕ
بە بیـری بـاڵاو نەسـتی ڕۆشنـــی لاشـەڕ
ژیـــرانە هەڵیـــان تەکێـــنن ! بەجـــوانی چاویـــان بشـــکێنن!
گێچەڵـی حیزانـە مەگـرن! نەقـورچ و گـەڕ
هەڵمەگـرن بیـری قڕێـژاوی، کۆنینەی تەنـگ!
مەبنەپـووش وچەڵتـووکی بێـنرخ و بێسـەنگ
بـــۆ بیـــرۆکراتی چەپـــەڵ و کـەچـــەڵ گـڵاو!
مەبنە پێشـدەرکەی مەسئولی، ڕابـوێر، پـێڵاو
نەکەن لەپەیـڤینـتـان بـۆیـان، دالەنگێنـــن!
نەکەن خۆتـان بەتووتکـە سـەگان بچوێنـن
بەبیانـــووی لێـــدانی کۆلکەخوێنـــدەواران

یا بۆ چەپڵە و بەخشیشی هەندێ بەرپرسـان
کە شایـەنـی داشۆریـن و تـف و جوێـنـن
خۆتـان بەسـەگی بەرەڵـڵاو دێـڵ و گـۆڵان مەچوێنـن!
کەرامەتـی ئینسـانیتان، بـۆ هەوەسـتتان مەدۆڕێـنن
شاعیرەکان..گەر ڕاست دەکەن دژی زوڵمن
وەک پەشێو و شێرکۆ و ڕەنجبەر
وەک شیعری قانیع و هێمن
وەک لۆرکا و حەلاجی مەزن
بـۆ ئـازادی ئەم مـیللەتە بچـریکێنن
لە پێنـاوی چەلاوی مەسئـولی ڕووزەرد مەشـیعرێنـن!
بۆدەسـکەوتی حەزی پـووچەڵ! دۆلاری سـەوز، مەشـیرێنن
بـۆ لـەوەڕ و گـەڕانی هەرزانـی بنەبـان! مەنـووزێنـن*
چیـدی ئەوهـا خۆتـان بچـووک مەکەنەوە، لە سـەگ مەچـن!
بەرەو پیـری فرۆشـیارانی هیـوای گەل و خاکتـان مەچـن!
بۆچی خۆتان نابووت دەکەن ؟
هانـا بـۆ وشـەی دۆڕاو و هەسـتێکی داڕوخـاو دەبەن؟
گەر تۆ ئینسان بوونی خۆت بـە بـێـزەوەر و کـەم بـزانی؟
چـۆن دەتـوانی پەلاری جـوان! بخێـوێنیە نـاوچەوانی؟
حوکمڕانـی، بێسـەواد و گەنـدەڵ بـەراست و ڕەوانـی؟
کە بـۆت نـالوێ، تێـی سرەوێنـی ودایشـۆرێنی زۆر بەجـوانی
گەرنـاتوانی بەم حـوکمەتە کـەچە بلێـی هەستـە بـڕۆ!
بێـدەنگی بنـوێنە وخـۆت بـۆ بەرژەوەندیـت مەکـە پـەڕۆ!
شاعیرە کان ...
گەر دەوێرن بەشیعری جوان

وەکـو حەزرەتـی شـێخ ڕەزا هـەجوویـــان کەن
سووک و ئاسان بەرنەشـتەری شـیعریان دەن
سـەیان تێـبەردەن تـا بەهـۆش خـۆ دێنـــەوە
بەڕوو ڕەشـــی وەکـــو سـەهۆڵ دەتوێنـــەوە!

مەبن بە جوانکەری زۆردار
تورگی بەرەڵا وکەمتیـار!
لە ئاژەڵبـــوون و زەلیلـــی دوور کەونـــــەوە
جـا چەتەکـان، بە هەجـووی جـوان بشـۆنەوە
کەی وایـە شیعـری بـاڵا بـەرزی نـــاوازە؟
بیانـدەنە بەر حەمـلەی موسـتەهەق و تـازە!
بگەڕێــنەوە بــۆ نــەستی ئینســانێتی بــە هێــز و سەنــگ
تـا هـەڵنەکێشــراون لـە ڕەگ تـاکونـــــــەدراون لـە بێـژینـگ
دونیـای ڕووناکتـــان لێ دیارە نەکەوتینــە نـاو گــۆڕی تەنـگ
مەبـن بـەسـەگ
تا لەبەر چاو، چەتەی بەدناو، بەسام دیـاربن، نەک لاپرەسـەنگ!
نووزاندن ؛ نوسکاندن

٢٠١٩/٤/٢٢

## بۆ كۆچی ئەمجارە

بێتاقەتبووین سی ساڵە هەر پێتان دەڵێین خۆتـان چـاكەن
دەركەوت زۆربێ كەلكـن بـۆیە هەر خـۆ لەمەنگـۆزی دەدەن!

دەڵێــی بە پـیلان ئەو گەلە و تێكشــكاند و بــێ ئومێـد كـرد
لە دوژمــن زیاترتــان پێكـرد !ئەوان زەفەریــان پــێ نەبــرد

ئەوەی بەشــداری ئەم حـوكمە بێســەرو گـوێیەی ئەوڕۆیە
ئۆبــاڵی لاوی مەزلــوومی ســـەرهەڵگرتووی لە ئەســـتۆیە

ڕووقایمیتشــان بەرچــاوە دەنــا دەبــوو گشـــتتان بــڕۆن
پــارەی دزراو بهێننــــەوە و قوڕی ژێر پێی كۆچبەر بخـۆن!

نەك خەڵكی ناچاربە كۆچكەن هەڵبێ لە دەست بێدادیتان
لە كــۆڵمان ببــنەوە تــا گەل ئاشــت بێــتەوە بە نیشــتمان

٢٠٢١/١١/٩

##ساڵیادی مەجیدی برام

مـن هەرگیـز لە بیـرت نـاکەم  بـرا جـوان و جـوامێرەکەم
بــێ تــۆییمان پێــوە دیــارە  ئەی پێشــمەرگە دڵێــرەکەم

مەجیـدەکەی ساڵح گـۆران  هەولێـر چـۆڵ و هـۆڵە بـێ تـۆ
تـا مـاوم، وای لە بەر چـاوم   بـۆت  دەگێـڕم شـین و ڕۆڕۆ

کاکە ژیانـت  گشـتی بەخشـی  لە ڕێـی گەل  و  نیشـتمانت
چەندجار لەسەنگەر زامداربووی، نەوەستای لە تێکۆشانت

تــۆ شــایەنی؛ تــاجی ســەری،  کوردســـتانێکی ئــازادی
تیایــدا نەتەوەی کــورد تێکــڕا  لەم خــاکە بـژی بە شــادی
٢٠٢٢/١٠/١٢

## كۆرۆنا ..لوتكەی شەڕانگێزی

"كەهەندێ كەس بەملعندی دژی خۆپارێزی دەدوان "

كۆرۆنای چـاوحیز، بێسـیفەت! دەیـهەوێ چـۆكمان پـێ بـدا
سـەرمایەی ئیمپریـالی وا لە لـوتكەی شـەڕانگێزی دا

جەنگـی بـایۆلۆجی لە گەڵ مرۆڤـایەتی ئەنجامـدەدا
دەیـهەوێ ملیۆنـان خەڵكـی لە سـەر زەوی پاكتـاو بكـا!

قێـزەونە و شـەڕی ترۆپكـی لە نـاوبردنی ئینسـانە
ئەوەی گومـانی لێـدەكرێ كاوبۆچییـەكی ڕەزاگـرانە

وەرن بـا لەم جەنـگە جیهـانییەدا تێكـڕای، مـافخوراوان
بەهۆشـیاری تەندروسـتی ڕێ بگـرین لە ڕوودانـی تـاوان

نـا بـۆ ڤایرۆسـی كۆرۆنـای بەرهەم هێـنراو، چەكـی بەدنـاو
بەڵێ بۆ خۆپارێزی لێی، پـاكژی دەست و لـووت، دەم وچـاو

هەمیشە دوور بە لە ڤـایرۆس قەڵەبـاڵغی و خـواردنی پـیس
تـا تێـدەپەڕێ كـۆڵنەدەن هەر دەشـكێ لەشـكری ئیبلـیس

ورەتـان قەت دانەبەزێ لێـی مەترسـن، خۆپـارێز بـن
ئەوە شـەڕی دەروونیـیە ڤایرۆسـە و دەبـێ بە هێـز بـن!

بــا یەکــتریمان خــۆش بــوێ بە خۆپــارێزی تێکدەشــکێ
سەرکەوتن بۆ زانســتە و هەر بەرەی وەحشــیگەری دەشــکێ

نەکەن بە لاملــی و نەفــامی پەتــا و ڤــایرۆس بــڵاوکەنەوە
باوەڕتــان بەزانســت قــووڵ بــێ بەســاغلەمی دەمێــنــنەوە

وەک کەرە دێز عاســێ مەبــن خــوا کەســی گێــژ ناپــارێزێ!
بێ دەمامک و دەسکێش لە ماڵ دەرمەچۆ مەچــۆ ناو ڕیزێ!

هەولێر ٢٠٢٠/٣/٨

ملعندی: لاملی

## ڕۆڵە گیان

ڕۆڵەگیـــــــــــــان ئەگەر دەتەوێ
زوو پێشــــکەوی کەس نەتگـــاتێ
ســـبەینێکەت لەمـــڕۆت نەچـــێ
باشـــترینیان بە گشـــت ســـاتێ

# جانتا هەلگر

شـــاخهاتی و گـــۆردە گەلێـــک زۆربـــوونە وای لەم ڕۆژگـــارە
چـــوونەتە ئـــۆردووی دەزگـــای ســـیخوڕی بـــۆ مشـــتێ پـــارە

جانتـــا هەڵگـــری حیزبیـــی بـــێ گـــوێنە! نـــایەن لە ژمـــارە
وەك هێستری چەمووش لوشـکە دەهـاوێن! لەم لادێ وشـارە

بـــووینە داردەســـتی حـــوکمی گەل چەوســـێن! دژ بەم هەزارە
گەلـــیش واقوڕمـــاو، تـــۆقێنرای دەســـتی چەتەی غەدارە

حەیـــفە ئەو خەڵكـــی باشـــوورە كـــزە و نـــوورەی لێنـــایێ
گەر بە پێشـــهاتێ ڕانەچڵەكێنـــدرێ نـــایێتە ڕایـــێ!

مەترســـن لێیـــان، گوێیـــان ڕاكێشـــن دز ترســـنۆكە
ئێـــوە یەكبگـــرن ئەوان دەڕووخـــێن، خـــوار لە ســـەرچۆكە!

چەورەی سەركز و جاسووسی حیزبی هیچیـان پـێ نـاكرێ
كە گەل ڕاپەڕی، ڕۆژی حیســـاب دێ ! تێیـــان هەڵ دەدرێ!

٢٠٢٠/٢/٧

## یاسای پارێزگاری چەتە

کە پەلارێکتـــــان لێـــــدەدرێ  کە بەردێکتـــــان تێـــــدەگیرێ
وەک شـــێت و هـــار پەلامـــاری  خەڵکـــی ئـــازادیخواز دەدەن
ئێـــوە کە قـــۆڵبڕ و چەتەن  بە بەرد و جنێـــو شایســـــتەن!
پێویســـــتمان بە یاســـــاییێکە  دز و خائینـــــان تەمبـــێ کـــــا
نەک نووزەی ئازادی ببـڕێ  دەرگـای ئومێـد بگـرێ لە قـوڕێ!
پەرلەمـــان تێـــری مشـــەخۆر  بکـات بە ماشـــەی زوڵـــم و زۆر!
ئەوەی پشـــــتگیری نانبـــــڕە  بە دایـــم هەر دەنگـــی گـــڕە
شـــایەنی جـــڕت و زینـــدانی و لێـــدانی تـــێلا و شـــوللاقە
بە پەڕۆی پـــیس فڕێـــی بـــدەی  لە پەنـــجەرە و لە دەلاقە!
یاســـــای پارێزگـــــاری چەتە  دەربچـــــوێنن، دەرنەچـــــوێنن
تـــازە گەل لێتـــان تـــوڕەیە   نەرمیتـــان لە ڕاســـت نـــانوێنن!
٢٠٢٠/٨/١٦

## مامۆستا زارا

گەوجیـــــنە زارا خوێنـــــدکاری قـــــانیعە و ڕۆڵەی ســـــنەیە
قـــوڕ بەســـەر ئەو داگیـــرکەرەی  تەمـــای بەم زەبـــر و زەنـــگەیە

## مەیدانی نەبەردی

هەر لە مەیـــــدانی نەبەردیـــــم  چەقیـــــوم چـــــۆکم نەداوە
گەرچـــی بەجەســـــتە پیربـــوویمە  بەڵام دڵـــم هێشـــتان لاوە

## دوومەترەقی زوڵمستان!

ئــاخ ئەو زوڵمســتانەی ئێــرە ســەرچاوەی کەلــلە ڕەقیــیە!
خۆیــان نــاو نــاوە دیمــوقراڕت! بەڕاســتیش دوومەتــرەقییە!★

ئازادیـــان خنکانـــدووە و دەشـــڵێن ئـــێمە کـــوردپەروەرین
ســەرکوتچی بـــێ ڕکــابەرن! هێشــتاش هەر دەڵــێن ڕابەریــن

ئەو هەمـــوو تـــۆمەت دانەپـــاڵ چـــاڵاکوان ڕاوەدوونـــانە
دوو مەترەقـــی حیـــزبییە بـــۆداوا نەکردنـــی نـــانە

بەچــکەی زاڵــم تێدەکۆشــێ تــا نەیــارانی بێــدەنگ کــات
لە تیڤییەکــان بە تێکــدەر و گێــرە شــێوێن ناویــان دەبــات

حــوکمی دوو مەترەقــی ئێــوە شایســتەی ئەو گەلە نیــیە
بوختــان بــۆ مــافخواز هەڵبەســتان ئەو پەڕی ترســنۆکییە

خـــۆ دەزانـــم کلکەکـــانی ئەو دوومەتـــرەقییە زۆرێکـــن
هەرکێی بێدەنگ بێ لەو زوڵمە پارسەنگی حوکمە و شــەریکن!

چاکسازی چــی؟ تۆقانــدنتان بــۆ مــانەوەی ســەر کورســییە؟
گۆڕانخــوازەکەی دوێنــێ کــوا ؟ ئێســتاکەی چەنــد شــوورەییە!

٢٠٢١/٢/١١

★مەترەق ...کوتەک ... قوتەداری دەستی شەڕکەر

## ڕۆندك*

عەیشـــان دەڵـــێ بـــابێ مـــن دادگـــایی مەكەن بـــێ تـــاوانە
ئەوەی پێـــدڤێ لە حەپســـێبێ، ســـەبەبكاری بێـــویژدانە

رۆنـدکی چـاڤێ عـەیشـانێ ڕیسـوای ئەو حوکمەتـان دەکـات
تۆقیـــون گەل ڕابـــن بـــۆیێ دەســـەڵات هێـــز بەکـــار دەخـــات
٢٠٢١/٢/٢٧

★ڕۆندك : فرمێسك

## دیوەخان

هەتا دیوەخان دەمڕاستی گەل بێ
دەبێ بارمان هەر
لەسەر پشتی کەر
یان هێستری شەل بێ !

هەولێر ٢٠١٧/٩/١٩

## باجی سەرکزی*

"کەلافاو تەنگی بە هەولێر هەڵچنیێ"

بــۆم نــاکرێ بتلاوێـــنمەوە ئەی هەولێـــرە بریـنـــدارەکەم
تــاقمێکی چـــاوچنۆک، زاڵـــم ڕەتانـــدوویەتی شـــارەکەم

ئێســـتا لە کارەســـات دەژیـــن هەژارانـــی هەولێـــرەکەم
بــێ ویژدانـــی بە نــاو خـــۆیی پســـاندی تەلـــی ســازەکەم!

هەولێـــری جـــاران نەمـــاوە بە دەســـت تاڵانچیـــان دامـــاوە
دانیشـــتووانە ڕەســـەنەکەی بڕبـــڕەی پشـــتی شـــکاوە

چاوبرسـیـیەکان وەک مـــۆتەکە شـــاریان لە قـــافێ کێشـــاوە
کەنـدو ڕێـی ئـاوی بارانیـان بـۆ قـازانجی پـووچ لووشـداوە

هەولێـــری کـــۆن و خەڵـــکەکەی بە هەژاری جـــێ هێڵـــدراوە
ڕێـــی ئـــاوەڕۆکەی گیـــراوە لە ژێـــر ڕەحمەتـــی لافـــاوە

هەولێـــری نـــوێی بەگلەرانـــیش! لای گرانبەهـــای ڕۆژئـــاوایە
شـــوێنی لەو هەولێـــرە جیـــایە کە خەڵکـــی ئاســـایی تیـــایە

هەنـدێ لە بـورجی عـاجییە و زۆریـنەش پشـت گـوێ خـرایە
خەڵکیـــنە زویـــر مەبـــن تێکـــڕا بـــاجی ســـەر کـــزیمان دایە!

٢٠٢١/١٢/١٧

★ "ساڵی لافاوەکەی هەولێر"

## بۆ نەوزاد ڕەفعەت

نەوزاد گیان ئەی پڕحەسرەت ترین پرسەی شیعرو جوانی ژیان
ئەی غەریبترین، غەریبی بێ پشت و پەنا و چاو پڕ گریان

ئۆغرت خێر، هەمیشە لە ڕۆحی هەولێریاندا زیندووی
تا مابم هەر یادت دەکەم هاوڕێی ئازیزمی نەمردووی

## لە تەنهایی دا

لە تەنهایی دا باشتر ڕووناکی دەبینم
لە خەڵوەتدا، جوانتر خوای پاکی دەدوێنم

ئای تەنهایی تۆ چەندە بێ ئازارو چەند بە حەوسەڵەی!
خەڵکی گەنیون تا ڕاددەی، درۆی بنکردە و سەرجەلەی!

## هەولێری نازدار

من چەشنی ماسیم بێ هەولێر نـاژیم
هەولێـرە دەریـای سـەرچاوەی شـادیم

هەرگیـز بـۆم نـاکرێ بە جێـی بهـێڵم
دوور لە هەولێـــرێ کەســـاس و وێڵـــم

قەڵا و منـــارەی جێـــی شـــانازیمە
لانـــکەی منـــداڵی و شـــوێنی وازیـــمە

هەولێـــری ڕەســـەن ڕەوشـــتی پـــاکە
چـــاو تێـــر و مەردە لە باشـــی تـــاکە

جێـــی قارەمـــان و گیـــان بـــازی وڵاتە
دوژمـــن بەزێـــنە و خـــاوەن قەڵاتە

مێـــژووی شـــاهیدە، غەریـــب پەروەرە
لە سـۆزو وەفـای، هەر خـۆی سـەروەرە

ئـێمه و هەولێـر وا  ئـاوێتەی یەکـین
ئاشـتی پەرسـتین  ئـازاو لا شـەڕین

هەولێـر پـایتەختی  پـێکەوە ژیـانە
مایەی خۆشبەختی  گشت هەولێریـانە

خـوایە ئـاواکەی  هەولێـری نـازدار
سـەری خەی بەسـەر پیلانـی زۆردار

چ داگیـــرکەرێ  چ دەســـتی دەرێ
نـــاتوانێ هەولێـــر لە خشـــتە بەرێ

شـــاری کـــوردانە  هەولێـــر بێگومـــان
ســـەر دانـــانوێنێ  بـــۆ دز و جەردان

چەنـدین دوژمـن هـات، شـکان لێـرانە
چـونکە هەو لێـر جێـی مەرد و مێـرانە

هەولێر ٢٠٢٢/١١/٥

## کۆستێکی گران

"بۆ مامۆستا سادق ڕۆستایی پێشکەشە"

هــۆ هــاوڕێیە زمــان دۆســتەکەم ســادقەکەی هەولێــر و ڕۆســت

ناکاو بروسکەی مەرگت گەیشت کۆستێکی گران، تاڵترین کۆسـت

چەنــدە شــیرین پەرتــووکی ئەم پڕۆگرامــانەت، کــوردی نووســکرد

دەســتت بە ســەریان داهێنــاو فێــر خــوازت بەرەو ئومێــد بــرد

ئەی ســادقە ســەر ڕاســتەکە بەو مەرگەت گەلێــک تاســاوم

کــوردە بە خــاک پەیوەســتەکە هەمیشــە وای لە بەرچــاوم

٢٠٢٢/٩/١٤

## بۆ دیدەنیت

حەزم لە دیــدەنیتە قوربــان دێــمە خــزمەت یــاری خــۆم

بەسەر دەکشێ دڵی لەت لەت، هەند عەبداڵی دیداری تــۆم

لە بــێ تــۆیی دا تــاریکە دونیــای ڕۆشــنی مــن بێشــک

بــازاڕ و قەیســەری ئێــرەم گشــت لا بــوویتە کــونە مشــک!

٢٠٢١/١٠/٢٠

## لەعەشقا

هەر کێ لە عەشـقا نەگـاتە  ئەوجـی دڵـی یـارچ ناکـات ؟
گەیشتن بە دامێنی چیـا  ئاسانە گشت کەس بۆی دەروات!

دڵـم بـێ یـار بـوویتە خەڵـووز  هێنـدە سـووتاوم  لە دووری
بە خەیاڵ دێنمە پێش چـاوم  وێـنەی یـارم  بەمەجبـووری
٢٠٢٢/١٢/٢

## سلێمانی

"بۆ یادی ٢٣٨ ی بنیاتنانی شاری سلێمانی"

شـاری شـارانم سـلێمانی  مەکـۆی شـۆڕش و قوربـانی
خۆشەویسـت و دڵگیرترینـی  بینـایی چـاوی کـوردانی

ناحەزە کێی تۆی خۆش نەوێ  وەک گۆیژەو ئەزمرت جوانی
دەسـتەمۆی بێگانـان نـابی  مێـژووت لە بەرزی دەڕوانـی

دەبێ خزمەتکاری تـۆ بێ   کێ خۆی بە حـوکمەت دەزانــی
دەنــا ڕۆژگــار تەمێــی دەکـا  زۆر ناکێشــێ چــاوەڕوانی

سـلێمانی تـۆ هەر پێشـەنگی  کـوردپەروەری و تێکۆشـانی
سـەرچاوەی دەنگـی زوڵاڵــی  شـیعر و هـونەر و گـۆرانی

سـەرچنار و پیـرە مەگـروون  جـوانن وەک قەڵاچواڵانــت
بنیــاتنەری سـلێمانی بـوون  شـێرانی پاشــای بابانــت

دڵ دەبــووژێننەوە کــاتێ  بـۆ خۆشــی دەچـیە سـەردانی
سـەر نـاکەوێ کێـی بـیهەوێ  بەرە و پـاش بـڕوا سـلێمانی

یــادی دامەزرانــت پیــرۆز، دوو سـەدو سـی وهەشــتەمی
ســلێمانی هێــزی ئومێــدی  کۆتــایی ڕەشــەبا و تەمــی

شاری کوردی و نالی ومەحوی  بەردەوام هەر پێشـدەکەوی
بەیـداخی هـزری سـلێمانی  بە هـیچ بەد کـارێ نـانەوی
هەولێر ٢٠٢٢/١١/١٤

## ژینا ڕۆژهەڵاتی

زەق زەق دیـــارە کە ئاخونـــدی جاهیـــل دژی ژن و ژیـــانە
زراوی دەڕژێـــتن بە شـــەوقی پەرچەمـــی زێرینـــی ژینـــا

هیچ پێت سەیر نەبێ تاریک پەرستانی چەرخـی بەردیـن
فێـــرن بە بەرد بـــارانی ژن، زینـــدە بە چـــاڵ و ســـەربڕین

دیـــارە ئەوان کە بەرگەی تیشـــکی ئـــازادی، ژنـــان نـــاگرن
گەر خۆر هەڵبـێ، شەمشـەمە کـۆرە چیـدی نـاتوانن بفـڕن!

کە ژینـاش سەرپۆشـی لادا هـاتە مەیـدانێ و ئـازاد بـوو
عەمامە لە سەر لای وایە تەخت و بەختی ئەو بەر باد بوو!

تـا سـەر ئەم حـوکمە گێڕەتـان بێشـک بـۆ نـاچیتە سـەرێ
کە ژن بـانگی ئـازادی دا دەبـێ ئاخونـد، بارکـاو هەرێ

مەزهەب گەرای مێشک شۆراو کوێردەبێ لە ئاستی جـوانی
نـاگرێ بەرگەی لێـزمەی ئـاوی بـاران و ڕووبـار و کـانی

عەقڵ بەنجکراوێ کاڵ فـامێ یـان سـیخەگەرێ ئاخونـدێ
ناشێ و ناکرێ بیکەی بە دەمڕاستی تاخێ یان هی گوندێ

ئەوان چـون مێشـک گەنیـون دژی جـوانینە ژنکـوژن
دەنـا کـوا ژیـان مانـای هەیە بـێ هەناسـەی ئـازادی ژن؟

خـاتوو ژینـا زینـدووەو وا ڕۆحـی دەژی لە ڕۆژ هەڵات
هـا کـا خـۆری ئـازادی ژن، هەڵهـات و دوژمنـیش هەڵات!

هەولێر ٢٠٢٢/٩/٢٤

## کینەسازی کورد کوژی

"کەلە ناوەندێکی ڕۆشنبیری لەپاریس، نەژادپەرەستێک چەند چالاکوانێکی کوردی تیرۆر کرد"

زوو پێم گوتن دیموکراسی ڕۆژئاواش پینەو پەڕۆیە
پێشکەوتنەکەشیان ڕووکەشە و جوانییەکی بێ تام و بۆیە
ئەوان، وان لە ژێر هەژموونی بەرژەوەندییەکی قێزەون
دەمامکی مافی مرۆڤیان ڕۆژ بە دوای ڕۆژێ دەکەون
دیسان باندی تیرۆریستی خرا گەڕ دژی ولات پارێزان
گەر پاریس خۆی شل نەکابۆی چەقەڵ ناگەنە جێی بازان

لە هەرکوێیەک بەخوێن دابێ لووتی کوردێکی بەڕوومەت*!
بە گەڕ خراوە ڕاسیزمێکی کەمالیستی سەر بە دەوڵەت
ڕۆژ نییە تیر نەدەن لە دڵی ئازادی خوازی ئەم خاکە
کینەسازی عوسمانلی بۆ کورد کوژی گەلێ چالاکە
دوژمن شەیدای خوێنخۆرییە و ڕاهاتووە و پڕ ئەزموونە
کوردیش کاری دڵسافییە و وەک نێچیر هەر پێوەبوونە!

٢٠٢٢/١٢/٢٤

*بەڕوومەت : بەشەرەف

ڕاسیزم :ڕەگەز پەرست

# ڕێز بۆ کەردانێن

نــازانم ئەو خەڵــکە بــۆچی یەخەی گوێــدرێژیان گرتــووە؟
کێی خراپیێ ێیدەڵێن کەرە، بێ عەقڵ و گەمــژە و گــوێ درێــژ؟
ئەو بەســـتەزمانەی لەوەتەی خــودا خــۆی خەڵقــی کــردووە
هەر لەخــزمەت گــوێ کورتبــووە لە پاکیــان تــا پاشــاو بە قڕێــژ!
پێــی دەڵــێن: کەر، گــوایە گەوجە درایــتە بەر قــامچی و نەقیــزە
کەچـــی کەر لەچـــاو هەنــدێکیان پــڕلە عـــیلمە و بە ئـــاوەزە
گوێ کورتێ جاهیــل بــێ ســەد قــات کەرتــرە لەجاشــێکی دێــزە
بلیمەتــیــش بێ پێم بــاشــە لێی خوڕی کامەی خــاوەن فیــزە!
کەر عـــاقڵە و لەمە چێــتر دوو پــێش هەن نـــاگەن بە هێســـتر!
خەڵکیــنە ڕێــز بــۆ کەر دانــێن نەک بــۆ ئەوەی لە گــژ کەرێــن!
واز لە کەری چــوار پــێ بێــنن دوو پــێ پشــتی کەر دەشــکێنن
چانییە کەر چەک بەدەست نییە کەس نــاکوژێ و نــاگەوجێنێ!
دەســـەڵات و کورســـیی نیـــیە تـــا خەڵکـــی پـــێ بتـــۆقێنێ
چـــوارپێیەک هەرگیــز پێــی نــاکرێ یەک فیشـــەکیش بتەقێنــێ
دووپێش هەن گوێ نـادەن دونیـا گشـت بە ئەتـۆم بفەوتێنــێ !
شــەڕ دوژمنـــی مــرۆڤە بــۆرژوا بــۆ مـــانی خــۆی دەیقەومێنـــێ
شـــەڕی ئۆکرانیـــا و ڕووســـیاش دژوارە کـــێ دەیوەســـتێنێ؟
ئەهلـــی فیکــرو عەقڵـــی دونیـــا زووبـــن شـــەڕخوازان ڕابگـــرن!
دەنــا سروشــت و مــرۆڤ هەمیــان بەژەهــراوی ئەتــۆم دەمــرن!
هەولێر ٢٠٢٢/١٠/٢٥

## چاونوقانێك

زەمەن چەنــد خێــرا هــات گــوزەری کــرد

چــاو نوقانێــک بــوو بە هەناســەی ســارد

عومرێــک بــوو پــڕی دەردەســەری بــوو

بێ بەزەیــی بــوو دڵ وەک گاشــەی بــەرد

بــۆدەرمــان نەمــدی خەمخــۆرێکی کــورد!

٣٠/١١/٢٠٢٢

## پاش مەرگە سات

"دوای بوومەلەرزەکەی باکوور و ڕۆژئاوا؛

مــن بولبــولێکی دەنــگ خۆشــبووم بەردەوام گــۆرانیم دەچــڕی

زەمـــین لەرزەیەکـــی ناکـــاو گەرووی زێڕینمـــی هەڵـــدڕی

خــوای میهرەبــان بــگە هانــای گیرخــواردووی ژێــرداروپەردوو

ئەشکی چاویان بوویتە خوێناو پاش مەرگەساتی کۆســتکەوتوو

٢٠٢٣/٢/٨

## شارژمکەوە

"پێشکەشە بە هاوژینەکەم"

لە ڕۆژی خۆشەویستیدا ڕۆحــی خۆمـت پێشـکەش دەکەم
گوڵی سووری ژینـی مـن تـۆی بـۆیە بەگـوڵ نـاوت دەبەم

دڵــم پەیوەســـتە بەو دڵەت بێـــی تـــۆ هەدادانـــم نیــیە
ئەگەر بــێ و تــۆ زویربــی لـێم مانــایەک بــۆ ژیـانم نیــیە

نەکەی دڵــت گەرد بگــری لـێم بە هەناســەی تــۆوە مــاوم
بە ئـامێزی پـڕ میهـری خـۆت شــارژمکەوە هەردوو چـاوم

هەولێر ٢٠٢٣/٢/١٥

شارژمکەوە : وزەم دەرێ، بمبووژێنەوە

## دهۆكی دەلال

ئەی شـــاری دهـــۆكی دەلال و ڕەنگیـــنم
زۆر دڵشـــادم لە پێشـــكەوتندا بتبیـــنم

ئەو دهـــۆكە جـــوانەی شـــاری بەرخـــودانە
خۆشەویســـتی دڵـــی مەیە، هـــی كـــوردانە

جێـــی پێكڤەژینـــی مەســـیحی و موســـڵمانە
دانیشـــووەكەی بـــادینی مەردی مەیـــدانە

ئاكرێ وشێخان و ئامێدی و زاخـــۆی جـــوانە
پـــرا دەلالـــی مێـــژووی پـــڕ لە كـــۆڵنەدانە

ســـۆلاڤ و ســـەرســـەنگ قیبلەگـــای دڵـــدارانە
خۆشـــترین جێـــی ڕابـــواردنی گەشـــتییارانە

دهـــۆكی تەژی ئەڤینـــی نیشـــتمانم
هـــۆ جـــوانترین نەوبـــووكی بونیـــادی مـــانم

جێـــی شـــانازی گەلـــی جزیـــر و بۆتـــانم
دڵـــی مەم و زینـــی عەشـــقی كوردســـتانم

هەولێر ٢٠٢٣/٣/٨

## زمانی کوردی

وەتـی★ دایکـم بە زمـانی شـیرینی کـوردی گۆشـی کـردم
لە خزمەتیـدام بە جـوانی چـون بەو زمـانە دیـارە کـوردم

زمانەکەمـان جێـی شـانازی و هۆکـاری مانەوەمـانە
خزمەتـی ئەرکە جـا بڵـێن، زمـانی نەتەوەمـانە!

پیسـکە بازرگـان بـۆ قـازانج زمـانی کـوردی وێـران دەکەن
کڕنـۆش بـۆعەرەب و عەجەم بـۆ بێگـانە و دۆلار دەبەن

زمـانی کـوردی ناسـنامەمە بە چـاپووکی دەیپـارێزم
بـژاری دەکەم لەخڵـت وخـار قـایمی دەکەم مەتەرێـزم

زمـانم گلێـنەی چـاومە بە خۆشەویسـتی ئەو دەژیـم
بە کـوردی گـۆرانی دەڵـێم قوربـانی چیـا و دۆڵ و کەژیـم

٢٠٢٣/٢/٢١

★وەتی : لەوەتی، لەوساکەوە

★مەتەرێز:سەنگەر

# فیشاڵی بنەماڵان

خـــانیچۆلەی منــداڵانیش بە ملهـــوڕی دروســـت نـــاکرێ
شــوێن و کـاتی خــۆی گەرەکە! دەوڵەت چــۆن وا پێکـدەهێنرێ؟

کە دۆڕاون حەی عەلســـەڵا کڵاوتـــان تێنـــاو کـــڵاش دڕاون!
یەخەی( پـــێ مـــیم) بەردەن، ئەوان پیـــرۆز و ڕێـــز لێگیـــراون

ئاشەکـە و ئـاو لێ بـــڕاوە و خوێنـــی خەڵکیشتـــان لا ئـــــاوە
دەوڵـەتـەکـە و قەڵـپ دەرچـــوو شپرزەیـیشتـــان بـەرچـــاوە

بـە کوردێـنی بێـــزەوەرتـــان کـەرکووکتـــان بـەم دەردەگەیـــــان
قـەیـرانی نــوێ و هێـنــاکایـە ئـەم فلیمەتـــان زۆری خـایـــان

گەلـــۆ چیـــدی بـــاوەڕ مەکەن بە فیشـــاڵی بنـــەماڵان
تێیان بخۆڕن ! هەڵیـان ببـڕن خەنـجەر بـۆ چییە لــە کـاڵان؟

چەند دێرێکەلەشیعرێکی درێژ          تشرینی دووەم ٢٠١٧

# بگەڕێوە شیرینەکەم

بـــۆ دیـــدارێکی وەک جـــاران  بە شـــەو ورۆژ دەنـــاڵێنم
ڕەحمـــێ بەحـــاڵم کە تـــاکەی  هەر بـەخەیـــاڵ ڕاتـهەژێنـــم؟
زووکە ســـەردانێکم بـــکە  تـــا لە ژیانـــدا مـــاوم زینـــدووم
چ فایـــدەیە لە پـــاش مەرگـــم  بگێـــڕی مـــاتەم و شـــینم!؟

لە دووریتـــــــا دەربەدەر و سەرلێشـــــــاو و دامـــــــاوم
کەینـــێ دڵـــت پـێم دەســـووتێ ؟ دەپرســـی لە حـــاڵی ســـەختم؟
مـــاچێکی ئەو دەمـــەم دەرێ  ژێـــرکەوە گیـــانی ڕەنجـــاوم
بـــێ تـــۆ هەرگیـــز نـــاگوزەرێ  ئەی ڤینووســـی خۆشەویســـتم

توخـــوا ئەو جـــارەش وەرەوە  دڵـــی شـــەیدام ئاشـــت کەرەوە
بـــێ تـــۆیی دەردێکـــی گـــرانە  دەســـت لە ملانـــی دڵ بەرەوە
زەمەن دەڕوا و جـــێمان دێڵـــێ  پەشـــیمانیش دادمـــان نـــادا
دولبەرێکـــــی دڵ بەری بـــــێ  ویـــــژدان مەبە زوو بێـــــرەوە

لە ژوانێـکی گەرم و گوڕ گەر  هاتی بـەدکار چـاوی دەرێ
ژین بێ تۆ هیچ مانای نییە  بـا ڕەقیب دڵی شـەق بـەرێ
وەک فـەرهاد کەوتوومـە کێـوان  نـازدار زامەکـەم زۆر قـووڵە
گەر لێوت نەچتە سەر لـێوان  ڕۆح لە جەستەم دەچتە دەرێ

تەمەنمـــان هەروا هەڵدەکشـــێ  لە پـــاییزیش ڕەتـــی داوە
بەهـــاری ئـــێمە زۆر کورتبـــوو  وەک گـــوڵی نێرگـــز ژاکـــاوە
بگەڕێـــوە شـــیرینەکەم  گـــوێ لە تـــرپەی دڵـــت بگـــرە
ئـــازابە و ئەوعەشـــقەت ســـەرخە  دەنـــا ئـــارامت فەوتـــاوە

٢٠٢٢/٨/١

## کورتەیەک لەژیانم

- "سابیر کوڕی حاجیساڵحی عەزیز گۆران"ــە، لەگوندی گۆمەگڕوی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی دەشتی هەولێر لە ساڵی ١٩٥٠ لە دایکبووە.
- لەتەمەنی حەوت ساڵییەوە لە هەولێر ژیاوە.
- هەموو قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و خانەی مامۆستایانیشی لە هەولێر تەواوکردووە.
- لە ساڵی ١٩٧٢ لە گوندی گرتگی دۆڵی ڕوستێ بە مامۆستای وانەبێژ دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٧٣ لە گوندی پیرئۆمەر بەمامۆستای بنەڕەتی دامەزراوە، ماوەی چل ساڵ پیشەی مامۆستایەتی کردووە.
- لە ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥ لە گوندی گوندەژۆر تا تێکچوونی شۆڕش ئەیلول مامۆستا بووە.
- ساڵی ١٩٧٥-١٩٧٧ بەڕێوەبەری قوتابخانەی دەربەند ڕایات بووە.
- لەساڵی ١٩٧٦ هاوسەرگیری کردووە، کوڕێک و پێنج کچی هەیە.
- ساڵی ١٩٧٧-١٩٧٩ لە گوندی گەعێتل مامۆستا بووە.
- ساڵی ١٩٧٩-١٩٨١ لە گوندی کەلەکان مامۆستا بووە.
- لە ساڵی ١٩٨١-٢٠١٣ لەم قوتابخانانە مامۆستایەتی کردووە، نیگار، کرمانج، ئەربیل ئولا، تەبایی، پیرەمیرد، نالی و هێمن (سیڤان).

- بەشداری کاری سیاسی لەناو (ی. ق. ک) و (پ. د. ک.) و (ی. ن. ک.) و کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان داکردووە.
- لەساڵی ١٩٨٣ وە وازی لەکاری حیزبایەتی هێناوە.
- بەشداری ڕاپەڕینی نۆهەدو یەکی کردووە.
- لە دامەزراندنی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی ساڵی ١٩٧٢ لەهەولێر بەشدار بووە.
- هەندێک لە بەرهەمەکانی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان و لاپەڕەی فەیسبوکی خۆی بڵاوکردۆتەوە.
- لە ساڵی نەوەت و یەک، لەکاتی کۆڕەوەکە، شێست "دانە"ی وەک یەکەم ناميلکەی شیعری خۆی بە فۆتۆکۆپی، بەناوی (سروودی نەورۆزێکی تازە) لە مەهاباد بڵاوکردۆتەوە.
- بەشداری چەندین میهرەجانی شیعری کردووە.
- لەساڵی ٢٠١٣ دا خانەنشین بووە.
- ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردستانە.
- بەشداری کۆنگرەی، ساڵی نۆهەد و دووی شەقڵاوەی یەکێتی نووسەرانی کوردستانی کردووە.

سابیر گۆران

٢٠٢٣/٥/٢٩